زنجیرەی گروپی نما ( ٨ ) ...

# چۆن پێغەمبەر(ﷺ) لای جگەرگۆشەکەت خۆشەویست دەکەیت؟

نوسینی: د. أماني زكريا الرمادي
وەرگێڕانی: زانا قەرەداغی

١٤٣٩ کۆچی
٢٠١٨ زاینی

● چۆن پێغەمبەر(ﷺ)لای جگەرگۆشەکەت خۆشەویست دەکەیت؟

● نوسینی: د. أماني زكريا الرمادي

● وەرگێڕانی: زانا قەرەداغی

● پێداچوونەوەی: عبدالله گەرمیانی

● بەرهەمی هەشتەم: گرووپی نما

● دیزانی ناوەوە: ناوەندی ڕێنوێن

● دیزاینی بەرگ: بەهمەن عومەر

● نۆبەی چاپ: یەکەم

● ساڵی چاپ: ٢٠١٨ ز – ١٤٣٩ ك

● تیراژ: ٣٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٦١٨)ی ساڵی ٢٠١٨ ی پێدراوە

**گرووپی نما بۆ چاپ کردنی کتێب و بەخشینی بەدیاری**

**بەخشینێکی کەم و پاداشتێکی نەبڕاوە.**

ئەم گرووپە لە ئێستادا لە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیس بوک ٦٠ ئەندامی هەیە، کە هەر ئەندامێك دەبێت چوار مانگ جارێك لانی کەم بڕی (٢٥٠٠٠)دینار بدات ئەگەر لە کوردستان بوو، بۆ ئەو کەسانەی لەدەرەوی کوردستان دەبێت لانی کەم چوار مانگ جارێك بڕی (٥٠دۆلار ) بدات تا کۆبکرێتەوە کتێبی پێ چاپ بکرێت و بەدیاری ببەخشرێت. هەموو کەسێك ئەتوانێ ئەو پاداشتە نەبڕاوەیە بەدەستبهێنێت. بەخشینێکی کەم.. پاداشتێکی نەبڕاوە. نوێنەرمان لە(هەولێر . سلێمانی . هەڵەبجە . کۆیە . رانیە . قەلادزێ . کەلار . دەربەندیخان . هەندەران)هەیە.

هەرکەسێك ویستی ئەم بەرهەمە چاپ بکاتەوە، با پەیوەندیی بکات بەم ژمارانەوە: ٠٧٧٠١٤٨٦٢٦٣ ـ ٠٧٥٠٣٢٤٠١٨٠ قاییەر

بەرهەمی ئایندەمان لە ٢٠١٨/٨/١ چاپدەکەین ان شا الله هەرکەس ویستی کرد لەو خێرەدا بەشداربێت پەیوەندیمان پێوە بکات.

❁ ❁ ❁

پێشکەشە بە ..................................................................

لەگەڵ رێزی زانا قەرەداغی ..................................................................

بەرواری / / ٢٠١٨

بەرهەمە چاپکراوەکانی گرووپی نما کە تـەنیا چـوار مـانگ جارێك بـە کۆکردنەوەی (٢٥٠٠٠) هەزار دینار چـاپکراون و بـەدیاری دابەشکراون، تۆش ئەتوانی بەشدار بیت.

١- چۆن نوێژ لای جگەر گۆشەکەت خۆشەویست دەکەیت؟.

تیراژ: نۆ هەزار دانە

٢- چۆن بالآپۆشیی لای کچەکەت خۆشەویست دەکەیت؟

تیراژ: چوار هەزار دانە

٣- بۆ ئەوەی بەختەوەر بیت. تیراژ: سێ هەزار دانە

٤- ئازاری موسڵمانان لە جیهاندا. تیراژ: سێ هەزار دانە

٥- پیلانەکان دژ بە ئافرەتانی موسڵمان. تیراژ: سێ هەزار دانە

٦- پەروەردەی ئیمانیی منداڵ. تیراژ: سێ هەزار دانە

٧- ڕۆژوو تیراژ: سێ هەزاردانە

٨- چۆن پێغەمبەر(ﷺ)لای جگەرگۆشەکەت خۆشەویست دەکەیت؟

تیراژ سێ هەزاردانە

# پێشەكی

## بەناوی خوای گەورەی میهرەبان

دروستكردن و پێگەیاندنی نەوە، گرنگترین خەمی نەتەوە زیندووەكانی جیهانە، ئەو نەتەوەو میللەتانەی خەمی داهاتووی خۆیان هەیە و ئەیانەوێ لەڕەوڕەوەی مێژوودا ڕۆڵی پێشەنگیی بگێڕن، چونكە سەرەنجام ئەو نەوەیەیە بڕیار لەسەركەوتن و دۆڕاندنی ئەو نەتەوەیە دەدات، گرنگترین شتێك بكرێت بۆ نەوەكان، پەروەردەكردنێكی ساغ و بەجێیە، پەروەردەكردنێك چاو لەپێشەنگەكانی مێژووی بكات، بۆ ئێمەی موسڵمانیش گەورەترین و جوانترین پێشەنگێك بریتییە لەپەیامبەری خوا(ﷺ)، خوای گەورە ئەوەی لێ داواكردووین، سەربووردەی پاك و زێڕینی ئەو ئازیزە بووەتە چرا ڕۆشنكەرەوەی ژیانی ئوممەت، بۆیە ئاشناكردنی ڕۆڵە و منداڵان بەژیاننامەی ئەو پەیامبەرە سەروەرە لەمڕۆدا پێویستترە لەهەموو ڕۆژ و سەردەمێكی تر.

دەبێ بەرانبەر بەو شەپۆلە ئیلحاد و ئارەزووبازییە وریا بین كە دەیانەوێ نەوە و ڕۆڵەكانمان بكەنە ئامانج، دەیانەوێ لەسەر چرۆی خۆمان مرۆڤێكی بێباوەڕی بێ ئامانج بێتەدی و ئەو ترووسكاییەی باوەڕ كە هەمانە بكوژێنەوە و هەموو شتێكمان لا نامۆ بێت.

پێویستە بانگخوازان و باوك و دایكانی خەمخۆر بەتەنگ ڕۆڵەكانی ئوممەتەوە بن، پشتگوێیان نەخەن، بەتایبەت زانا و وتارخوێنانی

مزگەوتـــەکان دەبـــێ ئاراســـتەکانیان زۆربـــەی بـــۆ چـــینی منـــداڵ و تازەپێگەیشتووان بێ، خوای گەورە پاداشتی کاک زانا قەرەداغیی بداتەوە کە لـەم بـوارەدا بـەوەرگێڕانی هەنـدێ نامیلکـەی بـواری پـەروەردەکردنی منداڵ خزمەتی باشی کردووە، هیوای سـەرکەوتن و پاداشـتی نـەبڕاوەمان بۆ هەیە.

عبدالله گەرمیانی
٢٠١٨/٤/٩



# پێشەکی نووسەر

## چۆن پێغەمبەر(ﷺ)لای مندالّ خۆشەویست بکەین؟

### ١- کامەیە خۆشەویستیی سەرومرمان ﷺ؟!

مەبەست لەخۆشەویستیی، تەنیا دەربڕینی سەرزارەکی و هەست و سۆز نییە،بەڵکو بەکار و کردەوە دەبێت خۆشەویستیی بۆ سەروەرمان دەربڕین، ئەوەی ئەو پێی خۆشە جێبەجێی بکەین ،ئەوەشی ئەو پێی ناخۆشە لێی دووربکەوینەوە، تامەزۆر بین بۆ دیداری ،خۆشەویستییمان بۆی لەبەر خوا و لەپێناو خودا بێت.

ئەبێت خۆشەویستمان(ﷺ) لەخۆمان ماڵ و سامان و منداڵەکانمان خۆشتر بوویت، لەفەرمودەیەکدا کە ئیمامی بوخاریی دەگێڕێتەوە،سەروەرمان(ﷺ)دەفەرموێت:(لا يؤمن أحدكم حتى أكون أحب إليه من والده وولده والناس أجمعين)). قال عمرُ : يا رسولَ الله ، لأنتَ أحبُّ إليَّ من كلِّ شيءٍ إلا مِن نفسي ، فقال النبيُّ صلى الله عليه وسلم: لا ، والذي نفسي بيدِه ، حتى أكونَ أحبَّ إليك مِن نفسِك. فقال له عمرُ : فإنه الآن ، واللهِ ، لأنتَ أحبُّ إليَّ مِن نفسي، فقال النبيُّ صلى الله عليه وسلم : الآن يا عمرُ"، واتا:هیچ کەسێك لەئێوە باوەڕدار نییە تاوەکو منی خۆشتر نەوێ لەدایك و باوکی و منداڵی و تەواوی خەڵکیی. عومەر وتی:ئەی پەیامبەری خوا، تۆ لەهەموو کەس خۆشەویستری بەلامەوە جگە لەخۆم نەبێ، پەیامبەریش فەرمووی:نە، سوێند بەخوا باوەڕدار نیت تا

لەخۆت خۆشەویستتر نەبم بەلاتەوە. عومەر وتی:ئێستا سوێند بەخوا لەخۆم خۆشەویستتری بەلامەوە، پەیامبەریش فەرمووی:ئێستا باوەڕداری ئەی عومەر.

لەفەرمودەیەکدا کە ئیمامی بوخاریی بۆمان دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هیچ کەستان باوەڕتان دانامەزرێت هەتا منی لە خۆی و ماڵ و منداڵی خۆشتر نەوێت، ئیمامی عومەر فەرمووی:ئەی پێغەمبەری خوا تۆم لەهەموو شتێك خۆشتر دەوێت تەنیا لەخودی خۆم زیاتر نەبێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نەخێر، سوێند بەو زاتەی کە گیانی منی بەدەستە هەتا لەخودی خۆت منت خۆشتر نەوێت"ئیمامی عومەر پێی فەرموو:ئێستا تۆم لەخودی خۆم خۆشتر دەوێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئێستا تەواوە ئەی عومەر.

## ٢- بۆچی پێویستە پێغەمبەر(ﷺ)مان خۆش بوێت؟

١– لەبەر ئەوەی خۆشەویستیی سەروەرمان لەبناغەی ئایینەکەمانە، باوەڕی هیچ کەس دانامەزرێت هەتاپێغەمبەر(ﷺ)ی خۆش نەوێت.

لە زۆرێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ)هاوتاکراوە بەخۆشەویستیی پەروەردگار، بۆ نمونە لەم ئایەتەدا فەرموویەتی:

﴿ قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾ (التوبة)

واتا:ئەی موحەممەد(ﷺ) بلێ ئەگەر باوکانتان و کوڕانتان و برایانتان و هاوسەرانتان و خزم و عەشرەتان و ماڵ و داراى یەك (بەزەحمەت) پەیداتان کردووەو بازرگانیەك کە دەترسن برەوی نەبێ(بێ بازاڕ بێ) و خانوو بەرەیەك کە پێ ی ڕازین خۆشەویست تره لاتان لە خواو پێغەمبەرەکەی و تێکۆشان لە ڕێگەکەیدا ئەوە چاوەڕوان بکەن هەتا خوا فەرمان(و تۆڵە)ی خۆی دێنێ(بۆتان) وە خوا ڕێنموونی کەسانی تێپەڕ لە سنوور ناکات.

ب- لەبەرئەوەی خۆشەویستی خوایە کە سوێندی بە ژیان و تەمەنی خواردووە و فەرموویەتی: ﴿ لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ لَفِي سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ ۝ ﴾ (الحجر)، واتا:سوێند بە تەمەن و ژیانی تۆ(ئەی موحەممەدﷺ)بەڕاستی ئەوانە لەسەر خۆشی خۆیاندا سەرگەردانن.

لە چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزدا ناوی پێغەمبەر(ﷺ) ڕاستەوخۆ بەدوای ناوی پەروەردگاردا هاتووە،لەشایەتوومان و لەبانگیشدا کە لەشەو و ڕۆژدا پێنج جار بانگ ئەدرێت.

لەنوێژدا لەکاتی خوێندنی تەحیاتدا کە واجب کراوە لەتەحیاتدا شایەتی و سەلاوات بدرێت لەدیداری .. ئەمە چ فەزڵێکی گەورەیە؟.

ج- لەبەر ئەوەی خۆشەویستیی پەروەردگارە لەشەوی میعراجدا، لە هەموو دروستکراوەکانی تر زیاتر ڕێزی لێگرت و نزیکی کردەوە لە خۆی، تەنانەت لە جوبرەئیلیش (علیه السلام).

پێغەمبەر(ﷺ)هەندێك تایبەتمەندیی پێدراوە كە بەكەسی تر نەدراوە، لەوانە:وەسیلە، كەوسەر، مەقامی مەحمود، بۆیە سروشتییە كە ئێمە پەروەردگارمان خۆش دەوێت ،دەبێ خۆشەویستیی ئەویشمان خۆشبوێت.

د- خۆشەویستیی سەرورمان(ﷺ): ئاسانكارییت بۆ دەكات كە شوێن سووننەتەكانی بكەویت، گوێڕایەڵیی فەرمانەكانی بكەیت، دووربكەویتەوە لەوانەی قەدەغەی كردوون، بەرەنجامی ئەمەش دەبێتە هۆی سەركەوتنی دنیا و دوارۆژ.

هـ- لەبەر ئەوەی پەروەردگار هەڵیبژاردووە لەناو گرۆی نەوەی ئادەم بۆ گەیاندنی پەیامی مەزن و پیرۆزی ئیسلام، تەنیا پەروەردگار خۆی دەزانێ كێ شیاوی ئەوەیە ئەو پەیامە مەزنە بگەیەنێت، بۆیە پێویستە پەیامبەری هەڵبژێردراومان زیاتر لە هەموو خەڵكیی خۆشتر بوێت.

هـ- لەبەرئەوەی پێشەوای مرۆڤایەتیی تاكە پێغەمبەرە لەڕۆژی دواییدا شەفاعەت دەكات بۆ ئوممەت و لەلایەن پەروەردگارەوە وەڵام دەدرێتەوە،لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە:" لِكُلِّ نَبِيٍّ دَعْوَةٌ مُسْتَجَابَةٌ، فَتَعَجَّلَ كُلُّ نَبِيٍّ دَعْوَتَهُ، وَإِنِّي اخْتَبَأْتُ دَعْوَتِي شَفَاعَةً لِأُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَهِيَ نَائِلَةٌ إِنْ شَاءَ اللَّهُ، مَنْ مَاتَ مِنْ أُمَّتِي لَا يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا "

واتا: هەموو پێغەمبەرێك نزایەكی هەبووە كە گیرابووە، هەموو پێغەمبەران پەلەیان كرد و لەدنیادا ئەو دوعایەیان كرد، بەڵام من ئەو دوعایەم هەڵگرت بۆ قیامەت. پشتیوان بەخوای گەورە بەدیدێت و

جێبەجێ دەبێت بۆ هەرکەسێ لە ئوممەتەکەم بمرێ و بەهیچ شتێك هاوبەشیی بۆ خوای گەورە بڕیار نەدابێ.

پێغەمبەر (ﷺ) لەڕۆژی قیامەتدا ئەفەرموێت: "خوایە ئوممەتەکەم ،خوایە ئوممەتەکەم".

و- لەبەرئەوەی تامەزرۆی بینینی ئێمەی کردووە، کاتێك لەناو هاوەڵەکانیدا بووە گریاوە، هاوەڵان پرسیان کردووە لە هۆکاری گریانی. ئەویش فەرمویەتی: "تامەزرۆی دیداری براکانم دەکەم"،ئەوانیش پێیان وتووە: کە ئایە ئێمە برات نین؟ ئەویش فەرمووی: "نەخێر، براکانم ئەوانەن باوەڕیان بە من هێناوە و منیان نەبینیووە".

ز- هەرکەسێکت خۆشبوێت لە قیامەتدا لەگەڵ ئەودا دەبیت، بۆیە ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ)مان خۆشبوێت، ئەوا لە فیردەوس دەبینە هاوسێی، لە فەرمودەیەکدا ئەنەسی کوڕی مالیك دەیگێڕێتەوە کە پیاوێکی دەشتەکیی هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: کەی قیامەت دێت؟ پەیامبەر(ﷺ) فەرمووی: "وما أعددت لها؟ قال حب الله ورسوله. قال "فإنك مع من أحببت"

واتا: ئەی پەیامبەر کەی قیامەت دێت؟. پەیامبەریش فەرمووی: "چیت بۆ قیامەت ئامادە کردووە؟ دەشتەکییەکە وتی: خۆشەویستیی خوا و پێغەمبەر. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: تۆ لەگەڵ ئەو کەسەی کە خۆشتدەوێت.

و- پەروەردگاری دروستکاری مرۆڤەکان زاناترە بە دروستکارەکەی، بۆیە لە وەسفیدا ئەفەرموێت: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ۝٤ ﴾ (القلم)

واتا: بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت و خویەکی ئێجگار بەرز و گەورەیت.

لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت:

﴿ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ۝١٢٨ ﴾ (التوبة)

واتا: سوێند بە خوا بەڕاستی بۆتان هاتووە پێغەمبەرێك لەخۆتان قورس و گرانە بەلایەوە نارەحەتی و ناخۆشی ئێوە زۆر سوورە لەسەر(باوەڕهێنان)تان بۆ بڕواداران دڵسۆز و میهرەبانە.

پێغەمبەر(ﷺ) لەبارەی خۆیەوە فەرمویەتی: "خوای پەروەردگار بە باشترین شێوە پەروەردەی کردووم".

لەبارەی ئاکار و ڕەوشتە جوانەکانییەوە بە نمونە هێنراوەتەوە، هەرکەسێ بینیبێتی باوەڕدار بێت یان بێباوەڕ، ئەوە متمانەی پێکردووە، بەر لەوەشی بێتە پێغەمبەر(ﷺ) نازناوی "الصادق الأمین"ی هەبووە، بۆیە شیاوی خۆشەویستییە!

ح- خوای پەروەردگار بە نوور و ڕووناکی وەسفی کردووە کە لە ناو تاریکی و گومڕایی دەرمان دەکات و ڕێنماییان دەکات بۆ ئەو کارە جوانانەی کە بۆ دین و دنیامان باشن، پەروەردگار دەفەموێت:

﴿ قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ وَكِتَٰبٌ مُّبِينٌ ۝١٥ ﴾ (المائدة)

ولتا: بێگومان بۆتان هاتووه لەلایەن خوداوه ڕووناکی یەکی گەوره و نامەیەکی ڕوون کەرەوه.

دیاره ئایینی ئیسلام وا بەئاسانیی بە ئێمە نەگەیشتووه، بەڵکو بە لەزانی خوای گەوره و هەوڵ و جیهاد و شەونخونیی پێغەمبەر(ﷺ) پێمان گەیشتووه سەرەڕای ئەوەی کە بێباوەڕان بە چەندین شێوه ویستویانه ڕێگری لێ بکەن، جارێك نەیانهێشتووه بانگەواز بکات و جاریکی تر ماڵی دنیا و ئافرەت و سەرگەورەییان خستۆته بەردەمی بۆ وازهێنانی، ئەویش بە ئەبو تالیبی مامی فەرمووه:

"ئەگەر خۆر بخەنە لای راستم و مانگ بخەنە لای چەپم، بۆ ئەوەی واز لەم کاره بهێنم واز ناهێنم".

پاشان ئازاری جەستەیی و دەروونیان دا، لەتائیف هەرچی منداڵ و هەرزەکار هەبوو هانیاندا دژی و بەردبارانیان کرد، هەتا خوێن بە قاچی پیرۆزیدا هاته خوارەوه ،پاشان لە شیوی ئەبو تالیب گەمارۆیان خستە سەری و پاشان لە شەڕی ئوحوددا ددانی پیرۆزی شکێنرا، لەشەڕی خەندەق لە برسا بەردی بەست بە سکییەوه، بەڵام هەر وازی نەهێنا تاوەکو پەیامی پیرۆزی ئیسلامی گەیاند.

ز- خۆشەویستیی ئەو، ئەو کاتە خۆشحاڵمان دەکات کە لەسەر حەوزی کەوسەر دەبینین و بە دەستی موبارەکی ئاوی کەوسەرمان ئەداتێ، کە دوای نۆشکردنی ئەو ئاوه هەرگیز تینووت نابێت.

ح- لەبەرئەوەی پێغەمبەر کۆتا خشتی قەڵای پێغەمبەرانە کە بەهاتنی ئەو، ئەو خشتە دانراوەو قەڵاکەی پێ تەواو کرا، لە صەحیحی موسلیم و بوخارییدا هاتووە، کە ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: "إنّ مَثلي ومَثلَ الْأنبِيَاءِ مِنْ قَبْلي كَمَثَلِ رَجُلٍ بَنَى بَيْتًا فَأحْسَنَهُ وَأجْمَلَهُ، إلّا مَوْضِعَ لَبِنَةٍ مِنْ زَاوِيَةٍ، فَجَعَلَ النّاسُ يَطُوفُونَ بِهِ، وَيَعْجَبُونَ لَهُ، وَيَقُولُونَ: هَلّا وُضِعَتْ هَذِه اللَّبِنَةُ؟ قَالَ: فَأنَا اللَّبِنَةُ. وَأنَا خَاتَمُ النّبِيّينَ"

واتا: نموونەی من و پێغەمبەرانی پێش خۆم وەك ئەوەیە کە پیاوێك خانوویەکی بۆ دروست کرابێت و شوێنی خشتێکی لێ مابێتەوە و خەڵکی بێن سەیری بکەن و بڵێن خۆزگە ئەو خشتە لەوێدا دابنرایە, من ئەو خشتەم و کۆتا پێغەمبەرم.

بۆچی ئەو باشترین پێشەنگە؟

ا- لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار زانایە بە ئێمە و بەویش- لەقورئانی پیرۆزدا لەبارەیەوە ئەفەرموێت:

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْآخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾ (الأحزاب)

واتا: سوێند بەخوا بەڕاستی لەپێغەمبەری خوادا(ﷺ) بۆ ئێوە هەیە سەرمەشقی و پێشەوایەتی چاك بۆ کەسێ بەهیوای خوا و(پاداشتی) ڕۆژی دواییەوە زۆر یادی خوا دەکات.

هیچ کەس بەقەدەر پەروەردگاری قەدری پێغەمبەر(ﷺ) نازانێ و وەکو ئەو نایناسێ قەدری ئەو زۆر گەورەیە لای پەروەردگار.

پەروەردگار دەیزانی کە ئاینی ئیسلام کەسێکی پێویستە بیگەیێنێ و بە کار و کردەوەش بەرجەستەی بکات لە ژیانی ڕۆژانەیدا، تا ببێتە پێشەنگ بۆ خەڵکیی، بۆیە خوای پەروەردگار پێشەوای مرۆڤایەتیی نارد و ئەویش ئاینی ئیسلامی بەگشتیی لە خۆیدا بەرجەستەکرد، بۆیە ئەو باشترینی پێشەنگی مرۆڤایەتییە.

ئەو هەڵبژاردەی ناو مرۆڤەکانە ،هەڵبژاردەی ناو پێغەمبەران و نێردراوەکانە، لەناو پێغەمبەرانیشدا ئولولعەزم جیاکراونەتەوە کە پێنج پێغەمبەرن، ئەم سەرداری ئەو چوار پێغەمبەرەشە.

پاشان هەڵبژاردەی کۆی نەوەی ئادەمیزادە و خوای پەروەردگار سینەی پاککردەوە و ناوی بەرز و بڵند کرد، پاشان قورسایی سەر شانی لابرد و لە هەموو ڕوویەکەوە پاکیکردەوە.

پاکی کردەوە لە ڕووی عەقڵ و ژیری و هۆشیارییەوە: ﴿ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ ۝ ﴾ (النجم).

سینگی پیرۆزی پاك کردەوە: ﴿ أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ۝ ﴾ (الشرح)

دڵی پاك کردەوە: ﴿ مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ۝ ﴾ (النجم).

ناوی پاك و بەرزو بڵند کرد: ﴿ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ۝ ﴾ (الشرح).

کارو کردەوەکانی پاك کردەوە: ﴿ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ۝ ﴾ (النجم)

حیلم و سۆزو بەزەیی پێبەخشی: ﴿ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ ﴾ (التوبة).

خوای پەروەردگار کردیە نمونەی بالا: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ (القلم).

پەروەردگار سەلاواتی لە دیداری داوە، تکاکاری رۆژی نارەحەتی قیامەتە، پەیامبەری کۆتا ئایینی خوای پەروەردگارە، خاوەنی مەقامی مەحمودە کە لەناو کۆی پێغەمبەراندا تەنیا بە ئەو دراوە.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ﴿٧٩﴾ ﴾ (الإسراء).

واتا: ئەی موحەممەد(ﷺ) لە بەشێکی شەودا هەستە شەونوێژ بکە بە قورئان خوێندن تێیدا ئەوە زیادە نوێژی تایبەت بەتۆیە ئومێدەوار بە پەروەردگارت بتگەیەنێتە پلە و جێگایەکی پەسەند کراو.

پێغەمبەر(ﷺ)لەفەرمودەیەکدا کە موسلیم بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێت:

«أنا سَيِّدُ وَلَدِ آدمَ يَوْمَ القِيامَةِ، وَأوَّلُ مَنْ يَنْشَقُّ عَنْهُ القَبْرُ، وَأوَّلُ شَافِعٍ وَأوَّلُ مُشَفَّعٍ»

واتا: من گەورەی نەوەی ئادەمم لە ڕۆژی قیامەتدا، یەکەمین کەسێکم لە قەبر دێمە دەرەو یەکەم تکاکار و یەکەم تکا قبولکراوێکم.

ب- لەبەر ئەوەی ئەو ئیمامی سەرجەم پێغەمبەرانە، لە شەوی میعراجدا لە مزگەوتی ئەقصا ئیمامەتیی بۆ سەرجەم پێغەمبەران کرد، ئەی نابێت ئێمەش بیکەینە پێشەواو سەرمەشقی خۆمان.

ج- لەبەرئەوەی فەزڵ و پلەو پایە و مەقامی لە هەموو پێغەمبەران بەرزترە، لە فەرمودەیەکدا کە ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە دەفەرموێت:

"فضلت على الأنبياء بست، أعطيت جوامع الكلم ونصرت بالرعب وأحلت لي الغنائم وجعلت لي الأرض مسجدا وطهورا وأرسلت إلى الخلق كافة وختم بي النبيون"،واتا:بەشەش شت فەزڵ و پلەم دراوە بەسەر کۆیی پێغەمبەراندا،زمان پاراوی لەگەڵ"جوامع كلم"

(مەبەست ئەوەیە فەرمودەی هەیە نێزیکە کەچی بە دە لاپەرە شەرحی تەواو نابێت)،ترسم خراوەتە دڵی دوژمنەکانم بەزیندوویی و بە مردوویی لێم دەترسن، دەستکەوتی جەنگم بۆ حەلاڵ کراوە، زەویم هەمووی بۆ کراوە بەمزگەوت، نێردراوم بۆ سەرجەم خەڵکی، بوومەتە کۆتا پێغەمبەر.

د- خوای گەورە پاراستوویەتی، هەمیشە ڕێنمونی کردووە، خوای پەروەردگار لەبارەیەوە فەرمویەتی:﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ۝ ﴾ (النجم).

واتا: لەئارەزووی خۆیەوە قسە ناکات.

هـ- لەبەرئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هەروەك ئیمە مرۆڤ بووە، برسی و تینوو تێر و دڵخۆش و دڵتەنگ بووە، چووەتە بازاڕ و پۆشاکی گرتووە، نەخۆش بووە و چاکبۆتەوە، ژنی هێناوە و منداڵی بووە و منداڵی مردووە،

ژنـی مـردووه، نیشـتەجێ بـووه و کۆچـی کـردووه، لەبـەر ئـەوه ئـەو پێغەمبەره(ﷺ) ژیانی وەکو کتێبێکی ئاوەڵا وایە ئەتوانی لە هەموو بوار و لایەنێکی ژیانەوه چاوی لێ بکەیت و بیکەیتە پێشەنگی خۆت.

نموونەی هەره باڵایە لە بارەی خێزان و ژیـانی هاوبەشـەوه، لـەئاکار و مامەڵـەکانی لەگـەڵ منـاڵان و خزمـانی لـەناو کۆمەڵگـەی ئیسـلامییدا، پێشـەنگە لـەکاری بانگـەواز و ئـارامگریی لەسـەری ، نـوور و ڕوونـاکیی ژیانمانە.

و- لەبەر ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) پێشەنگمانە لە هەڵسوکەوتی جوانی لەگەڵ هاوەڵان، لەکاتی دیار نەبوونی هەر یەکێکیان هەواڵی دەپرسین، لـە حاڵیانی دەپرسییەوه، چاوپۆشیی لـە هەڵـە و کـەم و کـورتیی دەکـردن ، هـانی ئـەدان لەسـەر کـاره چـاکەکانیان، بەسـۆز و بـەزەیی بـوو لەگـەڵ هـەژارەکانیان، جـوان مامەڵـەی دەکـرد لەگـەڵ منداڵـەکان، لەنـەزانی و نەفامیی دەریدەهێنان و فێری دەکردن.

بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) خۆشەویست بکەین لای منداڵەکانمان؟

١-چـونکە سـەرەتای گەشـەی منـداڵ باشـترین کاتـە بـۆ پێگەیانـدنی کەسایەتی، ئەگەر ئێمە بمانەوێت مناڵەکانمان پەروەردەیەکی موسڵمانانە بکەین، پێویستە لـە سـەرەتاوه خـوای پـەروەردگارو پێغەمبـەر(ﷺ)ی لا خۆشەویست بکەین، کاتێك پێداگریی ئەکات بـۆ ڕازیکردنـی دایك و بـاوکی گوێڕایەڵ و ئاسان ملکەچ ئەبێ.

ب- لەبەر ئەوەی منداڵ هەر لە منداڵییەوە لەسەر ئەو خۆشەویستییە ڕاهات. ئەوا کە گەورە بوو ئەو خۆشەویستییە قبوڵ دەکات، بە پێچەوانەشەوە ڕاستە کەسێ بە منداڵیی ڕانەهات لەسەر خۆشەویستیی، ئەوە لە گەورەبووندا پەروەردەکردنی قورس دەبێت.

ج- لەبەرئەوەی منداڵەکانمان ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ)یان خۆش ئەوێت، ئەوا شوێن ڕێبازەکەی ناکەون چەندە هەوڵیش بدەین لەگەڵیاندا.

د- لەبەر ئەوەی خۆشەویستیی پەیامبەر لە زۆر لایەنی ژیانمان بەخێرو بەرەکەت دەگەڕێنەوە بۆمان،ئەوەش ئەو خۆزگەیە کە هەر دلێك و باوکێ دەیخوازێ.

هـ- لەبەر ئەوەی پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا فەرمویەتی:

﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ (آل عمران).

واتا: ئەی موحەممەد(ﷺ) بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت کەواتە دوای من بکەون تا خواش ئێوەی خۆش بوێت وە لە گوناهەکانتان خۆش بێت وە خوا لێخۆشبووی میهرەبانە.

مرۆڤ بە خۆشەویستیی پێغەمبەر(ﷺ)،خۆشەویستیی خوای گەورە بەدەست دەهێنێ لە دنیاو دواڕۆژدا.

و - لەبەرئەوەی بەهەشت بۆ ئەوانەیە کە پێغەمبەر(ﷺ)یان خۆش دەوێت و گوێڕایەڵیی دەکەن، لە فەرمودەیەکدا کە ئیمامی بوخاریی گێڕاویەتیەوە دەفەرموێت :

عن أبي هريرة أن رسول الله (ﷺ) قال :"كُلُّ أُمَّتي يدْخُلونَ الجنَّةَ إلا منْ أبى ، قالُوا : يا رسُول اللّه ، ومنْ يأبى ؟ قال : منْ أطاعني دخل الجنّة ، ومنْ عصاني فقدْ أبى".

واتا: هەموو کەسێکی ئوممەتەکەم دەچێتە بەهەشتەوە تەنیا ئەوە نەبێ کە خۆی نایەوێ، وتیان: ئەی پەیامبەری خوا ئەوە کێیە کە نایەوێ؟ فەرمووی: هەرکەسێ گوێڕایەڵیم بکات دەچێتە بەهەشتەوە، ئەوەی سەرپێچیم بکات ئەوەیە کە نایەوێ.

ئایە دایك و باوك خۆزگە دەخوازن دوای خۆشەویستیی پەروەردگار و لێخۆش بوونی بچنە بەهەشتەوە؟

ز- لەبەر منداڵەکانمان ئەو سپاردەیەی خوای گەورەن کە دەبێت ئاگاداریان بین، لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە لێپرسینەوە لە باوك دەکات لەسەر منداڵەکانی, بەر لەوەی لێپرسینەوە بکرێت لە منداڵ لە باوانی، ئیبن قەیم دەفەرموێت هەرکەسێ منداڵەکەی پشتگوێ بخات لە فێرکردنی هەرشتێك سوودی پێ بگەیێنی، ئەوە ئامانجەکەی خراپ و ناشیرین کردووە. زۆربەی منداڵەکان بەهۆی پشتگوێخستنیانەوە لەلایەن دایك و باوکیانەوە کە فێری فەرمانی ئایین و سووننەتەکانیان ناکەن، بەمنداڵیی لە کیسیان دەچێت و کە گەورە بوون هیچ ئامۆژگارییەك سوودی نابێ.

## چۆن منداڵەکانمان فێری خۆشەویستیی پێغەمبەر ﷺ بکەین؟

### یەکەم: پێشەنگی چاکەکار

ئەبێت دایك و باوك بزانن، کە منداڵ وەکو ئامێری ڕادار وایە ،شتەکانی دەورووبەری وەردەگرێت، ئەگەر دایك و باوك بەڕاستی پێغەمبەریان خۆش بوێت، ئەوا منداڵەکە زۆر بەسروشتی ئەو خۆشەویستییە وەردەگرێت، بێ ئەوەی دایك و باوك هەوڵێکی ئەوتۆی لەگەڵ بدەن، چونکە منداڵ ئەو خۆشەویستییە لە چاوەکانیان دەبینێ، لە سۆزی قسەکانیان کاتێك باسی دەکەن، لە زۆری سەڵاواتدان لەسەری، بۆ تامەزرۆیی گەیشتن بە دیداری و هەمیشە دەڵێن حەزمان لە فلانە شتە لەبەر ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) حەزی لێی بووە، ئەو کارە دەکەین لەبەرئەوەی ئەو حەزی پێکردووە، فلانە کار ناکەین لەبەر ئەوەی ئەو قەدەغەی کردووە، ئێمە ئەم کارانە دەکەین خوای پەروەردگار ڕازی دەکەین و بەهیوای گەشتنین بە پێغەمبەر لەبەهەشتدا، بەو جۆرە منداڵەکەت بەهۆی ئەوەی تۆ بوویتە پێشەنگی چاك بۆی شیلەی خۆشەویستیی پێغەمبەر نۆش دەکات، کە پێشەنگ بوون ئاسانترین و کورتترین ڕێگەی پەروەردەکردنە.

موحەمەد قوتب دەڵێت: زۆر ئاسانە کتێبێك بنووسی لەسەر پەروەردەی منداڵ، یاخود پرۆگرامێك دابنێیت، بەڵام ئەو کتێب و پرۆگرامە هەر تەنیا نووسینێکی سەر کاغەزە، هەتا نەبێتە ئاکار و هەڵسوکەتی کەسێك، ئەو کەسە بە هەڵسوکەوت و خووڕەوشتی بەرجەستەی بکات، ئەوکاتە دەبێتە کتێب و پرۆگرام.

زۆر ناسرووشتییه تۆ داوای کارێك له منداڵهکهت بکهیت خۆت نهتوانی بیکهی.

نابێت ئێمه شتێکیان پێ بڵێین خۆمان پێچهوانهکهی بکهین، پهروهردگار لهو بارهوه فهرمویهتی:

﴿ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ (البقرة).

واتا: ئایا فهرمان بهسهر خهڵکیدا دهدهن بهچاکه؟ وه خۆتان فهرامۆش دهکهن (لهگهڵ ئهمهشدا) که ئێوه دهوری پهڕاوهکه(تهورات)دهکهنهوه دهی ئایا ژیر نابن و تێ ناگهن؟

له ئایهتێکی تردا دهفهرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٢﴾ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٣﴾ ﴾ (الصف).

واتا: ئهی ئهوانهی که بڕواتان هێناوه بۆچی ئهوهی ئهیڵێن ئهنجامی نادهن. زۆر مایهی ڕق و توڕهیی یه لای خوا که قسهیهك بڵێن کردهوهی پێ ناکهن.

**دووەم: لەهەر تەمەنێکدا بەشێوازی گونجاو مامەڵەی لەگەڵدا بکە**

**أ- قۆناغی دوای لەدایك بوون تا تەمەنی دوو ساڵیی.**

لەم تەمەنەدا کەسی پێشەنگ ئەتوانێت باشترین ڕۆڵ ببینێت، کاتێك منداڵ ئەبیستێ دایك و باوکی سەلاوات ئەدەن لەسەر پێغەمبەر(ﷺ)کاتێك ناوی دەبەن یان کەسێك ناوی دەبات، یاخود ڕۆژانی هەینی کە سەلاوات ئەدەن، بەم شێوە هەر بە منداڵیی ڕادێت لەسەر خۆشەویستیی پێغەمبەر(ﷺ)،ئەم خۆشەویستییە گەورە دەبێت لەگەڵیدا.

یاخود ئەو سرودانەی کە بۆ پێغەمبەر وتراون بۆی لێبدرێت.

**ب- تەمەنی سێ بۆ شەش ساڵی:**

منداڵ لەم تەمەنەدا زۆر حەز بە بیستنی چیرۆك دەکات، بۆیە چیرۆکی ژیانی پێغەمبەر(ﷺ)بە سادەیی باس بکە بۆی، کە ئەو پەیامبەرە خوای گەورە ناردی تاوەکو ئێمە ڕێنموونی بکات ، ڕێگای چاکەمان پێ بناسێنێ، لەخراپەکاریی دوورمان بخاتەوە، ئەوەی کار و کردەوەی چاك بکات ئەوا ئەچێتە بەهەشت، ئەوەشی کاری خراپ بکات ئەچێتە دۆزەخەوە، لەبارەی عبدالله باوکی و خاتوو ئامینەی دایکییەوە قسەی بۆ بکە، باسی لەدایك بوونی و باسی چوونی بۆ لای دایەنەکەی بۆ بکە خاتوو حەلیمە و بۆی باس بکە کە بەهەتیوویی گەورە بوو.

لەم قۆناغەی تەمەنیدا گرنگە فەرمودەی بۆ باس بکەیت و گفتوگۆی لەگەڵ بکەی لەسەر فەرمودەکە و ئەوەی ئەو لێی تێناگات بۆی ڕوونبکەیتەوە.

واباشە هەفتانە فەرمودەیەکی کورت لەبەر بکات لەگەل ماناکەی، نمونەی ئەم فەرمودانە:

من قال ( لا إله إلاّ الله دخل الجنة )، واتا: هەرکەسێ بڵێ لا إله إلا الله ئەچێتە بەهەشتەوە.

( إن الله جميل يحب الجمال )، واتا: خوای پەروەردگار جوانەو جوانیشی خۆش دەوێت.

( إن الله يحب إذا عمل أحدكم عملا أنْ يتقنه )، واتا: خوای گەورە حەز دەکات هەرکەسێکتان کارێکی کرد بەجوانیی ئەنجامی بدات.

( خيركم من تعلم القران وعلمه )، واتا: باشترینتان ئەو کەسەیە کە قورئان فێر دەبێت و خەڵکیش فێر دەکات.

( إماطة الأذى عن الطريق صدقة )، واتا: لابردنی ناڕەحەتیی لەسەر ڕێگا چاکەیە.

( لايدخل الجنة نمام )، واتا: قسەهێنەر و قسەبەر ناچێتە بەهەشت.

( من لم يشكر الناس لم يشكر الله )، واتا: ئەوەی سوپاسی خەڵکیی نەکات، سوپاسی خوای گەورەش ناکات.

( ليس منا من لم يرحم صغيرنا ويوقر كبيرنا )، واتا: ئەو كەسە لە ئێمە نییە کە بەسۆز نەبێت بەرامبەر بە بچوکەکانمان و ڕێز لەگەورەکانمان نەگرێت.

( المسلم من سلم المسلمون من لسانه و يده )، واتا: موسڵمان ئەو کەسەیە کە موسڵمانان لە زمان و دەستی پارێزراوبن.

( الكلمة الطيبة صدقة )، واتا: قسەی باش چاکەیە.

( لاتغضب ولك الجنة )، واتا: توڕەمەبە بەهەشت بۆ تۆیە.

( تبسمك في وجه أخيك صدقة )، واتا: زەردەخەنە کردنت بەڕووی براکەتدا چاکەیە.

( الراحمون يرحمهم الرحمن )، واتا: کەسانی بەسۆزو میهرەبان، خوای گەورە بەڕەحم دەبێت بەرامبەریان.

( من حسن إسلام المرء تركه مالا يعنيه )، واتا: لەڕەوشت جوانیی مرۆڤی موسڵمان، ئەوەیە واز لەکارێ بهێنێ کە پەیوەندیی بەوەوە نییە.

( خير الناس أنفعه للناس )، واتا: چاکترینی خەڵکیی ئەو کەسەیە کە سودی بۆ خەڵکیی هەبێت.

( الدين النصيحة )، واتا: ئایین ئامۆژگارییە.

( الجنة تحت أقدام الأمهات )، واتا: بەهەشت لە ژێر پێی دایکاندایە.

( تهادوا تحابوا )، واتا: دیاریی ببەخشن بەیەکتر، لای یەکتر خۆشەویست دەبن.

( التائب من الذنب كمن لاذنب له )، واتا: ئەو كەسەی لەتاوان پەشیمان دەبێت، وەك ئەوەیە كە تاوانی نەكردبێت.

( جعلت قرة عيني في الصلاة )، واتا: نوری چاوەكانم لە نوێژدایە.

( الحياء من الإيمان )، واتا: شەرم و شكۆ لە ئیمانەوەیە.

( آية المنافق ثلاث، إذا حدث كذب وإذا وعد أخلف وإذا أوتمن خان )، واتا: نیشانەی كەسی دووڕوو سێ شتە، قسە بكات و درۆ بكا، پەیمان بدات و نەیباتەسەر، سپاردەی لادابنێی ناپاكیی لێ بكات.

ج- قۆناغی نێوان حەوت بۆ دە سال.

لەم قۆناغەدا باسی هەڵوێستی پێغەمبەر(ﷺ)ی بكە بەرامبەر بە مندال، خۆشەویستیی بەرامبەر بەمندال، سۆزی بۆیان، ڕێزی لە مندال، یاری و گەمەكردنی لەگەڵیان، زۆر شتی تریش هەیە كە بۆی باس بكەیت، ئەگەر مندالەكە كچ بوو، ئەوا ئەوانەی بۆ باس بكە كە لە گەل كچدا بووە، بە پێچەوانەشەوە، ئەوە بزانە كە چیرۆك كاریگەریی زۆر لەسەر مندال دروست دەكات، ئەو هەستە لای مندال دروست دەكات كە لاسایی پالەوانی نێو چیرۆكەكە بكات.

د ـ باسی پێغەمبەر(ﷺ)ی بۆ بکە کە چۆن یاریی کردووە لەگەڵ حەسەن و حسێنی کچەزای.

* لەفەرمودەیەکدا کە عبداللەی کوڕی شەداد دەگێڕێتەوە:

أخْبَرَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ سَلَّامٍ قال : حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ قال : أنْبَأنَا جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ قال : حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أبِي يَعْقُوبَ الْبَصْرِيُّ ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَدَّادٍ ، عَنْ أبِيهِ ، قال : خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي إحْدَى صَلَاتَيِ الْعِشَاءِ وَهُوَ حَامِلٌ حَسَنًا أوْ حُسَيْنًا فَتَقَدَّمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَوَضَعَهُ ، ثُمَّ كَبَّرَ لِلصَّلَاةِ فَصَلَّى فَسَجَدَ بَيْنَ ظَهْرَانَيْ صَلَاتِهِ سَجْدَةً أطَالَهَا قَالَ : أبِي فَرَفَعْتُ رَأْسِي وَإذَا الصَّبِيُّ عَلَى ظَهْرِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ سَاجِدٌ فَرَجَعْتُ إلَى سُجُودِي فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الصَّلَاةَ قَالَ النَّاسُ : يَا رَسُولَ اللَّهِ إنَّكَ سَجَدْتَ بَيْنَ ظَهْرَانَيْ صَلَاتِكَ سَجْدَةً أطَلْتَهَا حَتَّى ظَنَنَّا أنَّهُ قَدْ حَدَثَ أمْرٌ أوْ أنَّهُ يُوحَى إلَيْكَ قَالَ : " كُلُّ ذَلِكَ لَمْ يَكُنْ وَلَكِنَّ ابْنِي ارْتَحَلَنِي فَكَرِهْتُ أنْ أُعَجِّلَهُ حَتَّى يَقْضِيَ حَاجَتَهُ " .

واتا: پێغەمبەری خوا لەنوێژێکی عیشادا حەسەن یان حوسەینی هەڵگرتبوو دەرچوو بۆ لامان و داینا و تەکبیرەی نوێژی کرد و کڕنوشێکی برد درێژەی کێشا، سەرم بەرزکردەوە بینیم منداڵەکە لەسەر پشتی پێغەمبەری خوایە و ئەو لەسجوددایە، بۆیە درێژەم بەسجودەکەی خۆم دا، کە پێغەمبەری خوا لەنوێژەکەی بوویەوە خەڵکیی وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا سجودی نوێژەکەت درێژەی کێشا تائەوەی وەهامان

گومان برد شتێك ڕوویدابێ یان وەحیت بۆ هاتبێ، پێغەمبەریش فەرمووی: هیچ یەك لەوانە نەبوو، ئەم کوڕەم لەسەر پشت بوو نەمویست پەلەی لێ بکەم تاوەکو خۆی حەزی نامێنێ و دادەبەزێ.

* لەفەرمودەیەکی تردا کە عبداللەی کوڕی بورەیدە دەگێڕێتەوە:

حدَّثنا الْحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ ، حدَّثنا عليُّ بْنُ حُسينْ بن واقدٍ ، حدَّثني أبي ، حدَّثني عَبْدُ الله بْنُ بُرَيْدَةَ ، قال : سمعْتُ أبي بُرَيْدَةَ ، يقُولُ : كان رسُولُ الله صلَّى اللَّهُ عليْه وسلَّم يخْطُبُنا إذْ جاء الْحسنُ والْحُسيْنُ عليْهما قميصان أحْمَرَانِ يمْشيان ويعْثُران ،فنزل رسُولُ الله صلَّى اللَّهُ عليْه وسلَّم من الْمنْبر فحملَهُما ، ووضعهُما بيْنَ يديْه ، ثُمَّ قال : " صدق اللَّهُ إنَّما أمْوالُكُمْ وأوْلادُكُمْ فتْنَةٌ سورة التغابن آية ١٥ فنظرْتُ إلى هذيْن الصَّبيَّيْن يمْشيان ويعْثُرانِ ، فلمْ أصْبرْ حتَّى قطعْتُ حديثي ورفعْتُهُما " .

واتا: پێغەمبەری خوا وتاری بۆ دەداین حەسەن و حوسێن هاتن و دوو قەمیسی سووریان لەبەردابوو، ڕێیان دەکرد و دەکەوتن، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر مینبەرەکە دابەزی و هەردووکیانی هەلگرت و لەبەردەست خۆی داینان و پاشان فەرمووی: خوای گەورە ڕاستی فەرمووە کە ماڵ و منداڵتان فیتنەن، ڕوانیم ئەم دوو منداڵە ڕێ دەکەن و دەکەون، خۆمم پێ ڕانەگیردرا وتارەکەم بڕی و هەڵمگرتن.

ئیمامی بوخاریی لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت:

قَبَّلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الحَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ وَعِنْدَهُ الأَقْرَعُ بْنُ حَابِسٍ التَّمِيمِيُّ جَالِسًا، فَقَالَ الأَقْرَعُ: إِنَّ لِي عَشَرَةً مِنَ الوَلَدِ مَا قَبَّلْتُ مِنْهُمْ

أحدًا، فنظر إليه رسولُ اللهِ (صلّى اللهُ عليهِ وسلّمَ) ثمَّ قالَ: «مَنْ لا يَرْحَمُ لا يُرْحَمُ».

واتا: پەیامبەری خوا(ﷺ) ماچی حەسەنی کوڕی عەلیی کرد و ئەقرەعی کوڕی حابسی تەمیمیی لا دانیشتبوو، ئەقرەع وتی: من دە کوڕم هەیە تاوەکو ئێستا هیچیانم ماچ نەکردووە، پەیامبەری خوا(ﷺ) تەماشایەکی کرد و پاشان فەرمووی: هەرکەسێ بەزەیی نەبێ، ئەوە خوای گەورەش بەزەیی بەرانبەر نابێ.

* له فەرمودەیەکدا که خاتوو عائیشەی دایکی باوەڕداران (خوا لێی ڕازیی بێت) دەگێڕێتەوە:

" جَاءَ أعْرَابِيٌّ إلى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، فَقَالَ : أتُقَبِّلُونَ صِبْيَانَكُمْ ؟ فَمَا نُقَبِّلُهُمْ ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : أوَ أمْلِكُ لَكَ أنْ نَزَعَ اللهُ مِنْ قَلْبِكَ الرَّحْمَةَ ؟ " .

واتا: ئەعرابییەك هاتەلای پەیامبەری خوا(ﷺ) و پرسی: منداڵەکانتان ماچ دەکەن؟ ماچیان ناکەین، پەیامبەری خواش(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: من ناتوانم بەزەیی بخەمە دڵتەوە کاتێك کە خوای گەورە بەزەیی لەدڵت دەرهێنابێ.

پێغەمبەر(ﷺ) زۆر خاکەرا و سادە بووە لەگەڵ منداڵدا بەگشتی و زۆر بەتایبەت لەگەڵ کچەزاکانیدا، ئیمامی حەسەنی دەخستە سەر شانی پەڵنی و ماچی دەکرد و بەدەمیەوە پێدەکەنی، یاریی لەگەڵ دەکرد و ڕای دەکرد بەدوایدا و ئەیگرت ، پێغەمبەر(ﷺ) کەمێك ئاوی ساردی

دەکردە دەمی پیرۆزی و ئەیکرد بەدەموچاویدا و پێدەکەنی و زمانی دەردەکرد بۆ ئیمامی حوسێن و ئەویش ئەیەویست بیگرێ و پێدەکەنی.

ئەگەر کارێکی نادروستیان بکردایە، ئەوا بەسۆزو میهرەبانییەوە هەڵەکانی بۆ ڕاست دەکردنەوە، ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە:

"أخذ الحسن بن علي تمرة من تمر الصدقة فجعلها في فيه. فقال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): «كخ كخ ارم بها أما علمت أنا لا نأكل الصدقة!»".

واتا: حەسەنی کوڕی عەلیی خورمایەکی سەدەقەی خستە دەم، پەیامبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: کخ کخ فرێی بدە ئایە نازانی ئێمە لە سەدەقە ناخۆین!

ب- وێنەیەکی تر لە ژیانی پێشەوای مرۆڤایەتی:

برایەکی ئەنەسی کوڕی مالیک کە پێیان دەوت ئەبا عومەیر، باڵندەیەکی بچووکی کڕی بوو زۆر دڵخۆش بوو پێی، هەرکات پێغەمبەر(ﷺ)دەیبینی هەواڵی باڵندە بچووکەکەی دەپرسی و دەیفەرموو ئەباعومەیر نوغەیر چییکرد؟ جارێك پێغەمبەر(ﷺ)ئەڕۆیشت بۆ بازاڕ، بینی ئەبا عومەیر دەگری، پرسی بۆچی دەگریت؟ وتی" نوغەیر مردووە، پێغەمبەر(ﷺ)لای مایەوە و قسەی خۆشی زۆری بۆ کرد و دڵنەوایی کرد و یاریی لەگەڵ کرد تا کەوتە پێکەنین و دڵیخۆش بوو، یەکێك لەهاوەڵان ئەوەی بینی، لە پێغەمبەر(ﷺ)پرسی کە بۆچی دانیشتووی لەگەڵ ئەو منداڵە؟ ئەویش فەرمووی:" باڵندەکەی مردووە دڵخۆشییم دایەوە".

ج- سۆز و بەزەیی پێغەمبەر(ﷺ) بەرامبەر بە گریانی منداڵ لە نوێژدا:

ئەنەس بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: هەرکاتێك پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی بۆمان بکردایە و گوێی لە گریانی منداڵێك بووایە، نوێژەکەی کورت دەکردەوە، پێغەمبەر(ﷺ) خۆی باسی ئەوەمان بۆ دەکات و دەفەرموێت: هەرکاتێك نوێژ بکەم و بمەوێت نوێژەکە درێژ بکەم کە گوێم لە دەنگی گریانی منداڵێك دەبێت نوێژەکە کورت دەکەمەوە، چونکە دەزانم دڵی دایکی ئەو منداڵە چەند ناڕەحەت دەبێت کە گوێی لە گریانی منداڵەکەی دەبێت.

ه- هاوڵی کردنی منداڵ:

پێغەمبەر(ﷺ) منداڵی دەهێنا بۆ مزگەوت و بەسۆز و میهرەبانییەوە دەستی بەسەردا دەهێنان تا هانیان بدات بێن بۆ مزگەوت.

جابری کوڕی ئەبی سەمرە(ڕەزای خوای لەسەر بێت) دەگێڕێتەوە: نوێژی نیوەڕۆم لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) کرد، پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە بۆ ماڵەوە لەڕێگا دوو منداڵی بینی بەدەستی موبارەکەی دەستی بەسەر و ڕوخساری هەردوو منداڵەکەدا هێنا، منیش خۆم گەیاندێ و وتم: با لەو بەرەکەتە بێبەش نەبم، دەستی بەسەر و ڕوخساری منیشدا هێنا دەستی موبارەکی ساردبوون و بۆنیشیان ئەوەندە خۆش بوو ئەتوت دەستی موبارەکی کردووە بە کۆزەی پڕ لەگوڵاودا.

ز- بەخشین بە منداڵان:

ئیمامی موسلیم لەئەبو هورەیرەوە دەگێڕێتەوە کە خەڵکی هەرکات تۆبەرەی بەرهەمیان پێ بگەشتایە، دەیانهێنایە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش ئەم نزایەی بەسەردا دەخوێند:

اللهم بارك لنا في ثمرنا وبارك لنا في مدينتنا وبارك لنا صاعنا وبارك لنا في مدنا.

واتا: خوایە گیان بەرەکەت بخەرە بەرووبووم و مەدینە و خۆراك و تووێشوومان.

پاشان بچوکترین منداڵی بانگ دەکرد و تۆبەرەی میوەکەی پێ ئەدا.

و- لەنوێژدا منداڵی لەباوەش ئەگرت:

لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە لەقەتادەوە دەگێڕێتەوە:

"أنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يُصَلِّي وَهُوَ حَامِلٌ أُمَامَةَ بِنْتَ زَيْنَبَ بِنْتِ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ، وَلِأَبِي العَاصِ بْنِ رَبِيعَةَ بْنِ عَبْدِ شَمْسٍ فَإِذَا سَجَدَ وَضَعَهَا ، وَإِذَا قَامَ حَمَلَهَا".

واتا: پەیامبەری خوا(ﷺ) نوێژی دەکرد و ئومامەی کچی زەینەبی کچی خۆی هەڵگرتبوو، کە کچی ئەبی ئەلعاص ی کوڕی رەبیعەی کوڕی عەبد شەمس بوو، کە دەچووە کڕنۆش دایدەنا و کە هەڵدەستایەوە هەڵیدەگرتەوە.

ز- ڕێزگرتنی لەمندالْ:

زۆربەی کات لە کۆڕی زیکری و زانستەکانی پێغەمبەر(ﷺ)دا منـدالْ ئامادە دەبوون،لەیەکێك لەو کۆڕانە دوو مندالْ لای ڕاستی دانیشتبوون،لای چەپیش پیاوە گەورەو بەتەمەنەکان دانیشت بوون،هەندێك ئاویان هێنا، پێغەمبەر(ﷺ)خواردییەوە و پاشان بەمندالْەکانی وت کە لای ڕاستییەوە دانیشتبوون، ڕێگەم ئەدەن ئاوەکە بدەم بە پیاوە گەورەکان،منـدالێکیان وتی، نە بەخوا ئەی پەیامبەری خودا ئەوەی لەتۆ ماوەتەوە نایدەم بەکەسی تر و خۆم ئەیخۆمەوە،پێغەمبەر(ﷺ)ئاوەکەی دا بەمندالْەکە.

عبداللەی کوڕی عامر (ڕەزای خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە کە جارێك پێغەمبەر(ﷺ)لەماڵمان بوو، دایکم بانگی کردم وتی وەرە عبداللە ئەو شتەت ئەدەمێ، پێغەمبەر فەرمووی:"چی ئەدەیتێ؟" ،دایکم وتی: ئەو خورمایەی ئەدەمێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:"گەر ئەوەت پێ نەبوایە، ئەوا بە بەدرۆ لەسەرت دەنوسرا".

ح- وەسێتی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ بەخێوکردنی کچ:

لەسەردەمی نەفامییدا بوونی کچ نەنگی و شورەیی و مایەی خەم بوو، پێغەمبەر(ﷺ)لەفەرمودەیەکدا فەرمویەتی:" هەرکەسێ سێ کچی هەبێت و ئارام بگرێ لەسەر ناخۆشی و ناڕەحەتیی بەخێوکردنیان، ئەوا ئەچێتە بەهەشتەوە، پیاوێك وتی ئەی دوو کچ؟ فەرمووی:"ئەگەر دووانیش بێت"، پیاوێکی تر وتی: ئەگەر یەك کچ بێت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:"ئەگەر یەك کچیش بێت".

ز- ڕاستکردنەوەی هەڵەکانیان و سووربوونی لەسەر ئامۆژگاریی کردنیان بە شێوازێکی جوان تا هەڵەکانیان لەڕەگەو ڕیشەوە لەناو ببات:

هاوەڵێکی پێغەمبەر(ﷺ) خزمەتکارێکی خەڵکی فارس بوو، ئەڵێ لەگەڵ پێغەمبەردا بەشداری ئوحود بووم و لە پیاوێکی موشریکمداو وتم ئەم لێدانەم لێبگرە من لاوێکی فارسم، لام کردەوە بەلای پێغەمبەردا فەرمووی:"خۆزگە دەتووت لێمی بگرە من لاوێکی ئەنصارییم".

عبداللەی کوڕی عومەر شەونوێژی نەدەکرد، جارێک پێغەمبەر(ﷺ)پێی فەرموو:"عبدالله باشترین پیاوە ئەگەر شەونوێژ بکات" لەدوای ئەم قسەیەوە عبدالله زۆربەی کاتەکانی شەوی بەشەونوێژ بەسەر دەبرد.

ح- پێغەمبەر(ﷺ)هاوەڵانی فێر دەکرد کە چۆن نهێنی بپارێزن:

عبداللەی کوڕی جەعفەر (ڕەزای خوای لەسەر بێت) دەڵێت: جارێك لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)لەپشتی ئەسپێك سوار بووبووم، قسەیەکی بۆ باس کردم و پێی وتم کە لای کەس باسی نەکەم.

ت- سۆزی بەرامبەر بە خزمەتکار:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لەسەربێت) دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ)بانگی دەکردین دەیفەرموو"کوڕم"یاخود"ئەنیس "کە ئەمە کورتکردنەوەی ناوە وەك ڕێزێك، ئەنەس دەفەرموێت:

دە ساڵ خزمەتی پێشەوای مرۆڤایەتییم کرد، واللەی پێی نەوتووم ئۆف ، یان بۆچی ئەوەت کردیان بۆ ئەوەت نەکرد.

ك - پێشبڕكێ:

پێغەمبەر(ﷺ) زۆرجار پێشبڕكێی بە مندالآن دەكرد تا بیر و هۆشیان چالاك بێت و گەشە بە تواناكانیان بدات و هیممەتیان بەرز بكاتەوە و توانا شاراوەكانیان دەربخات.

پێغەمبەر(ﷺ) پێشبڕكێی كرد لەنێوان "سەمرە"و"رافع"كە دوو لاوی تازە پێگەشتوو بوون حەزیان كرد بەشداریی جیهاد بكەن، بەهۆی كەمیی تەمەنیانەوە پێغەمبەر(ﷺ)هەردووكیان رەتكردەوە،"سەمرە"وتی من لەوەشاندی تیردا زۆر باشم و دەستم ڕاستە،"رافع "وتی منیش لە زۆرانبازیدا زۆر بەتوانام، پێغەمبەر(ﷺ) زۆرانی بەهەردووكیان كرد،"رافع" بردییەوە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ)مۆڵەتی هەردووكیانی دا.

ل- سۆزو بەزەیی پێغەمبەر(ﷺ)بەرامبەر بە ئاژەلان، چەند نمونەیەك:

چیرۆكی ئاسكەكە، ئەنەسی كوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێت) بۆمان دەگێڕێتەوە،پێغەمبەر(ﷺ) بەلای كۆمەڵێك خەڵك تێپەڕی بینی ئاسكێكیان ڕاو كردووەو بەكۆڵەكەیەكەوە بەستوویانەتەوە، ئاسكەكە بە پێغەمبەری وت كە ئەم ڕاوچیانە گرتوویانە و دوو بێچووی هەیە، داوای كرد لە پێغەمبەر(ﷺ)كە تكای بۆ بكات بەری بدەن تا شیر بدات بە دوو بێچوەكەی و بێتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: كێ خاوەنی ئەم ئاسكەیە با ئازادی بكات تاوەكو شیر بدات بە بێچوەكانی و بێتەوە، وتیان كێ دەبێتە كەفیلی؟ فەرمووی: من، ئاسكەكەیان بەرداو چوو شیری دا بە

بێچوەکەی و گەڕایەوە، ئەوانیش بەستیانەوە، پێغەمبەر(ﷺ)ئاسکەکەی کڕی و ئازادی کرد.

جارێـك پێغەمبـەر(ﷺ)چـووە بـاخی گـەنجێکی ئەنصـاریی، لـەناو باخەکەدا وشترێکی لێ بوو، کـە پێغەمبـەری بینـی فرمێسك بەچاوەکانی هاتـە خـوارەوە، پێغەمبـەر(ﷺ)فـەرمووی کـێ خـاوەنی ئـەم وشـترەیە؟ گەنجە ئەنصارییەکە وتی من. پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: لەخوا بترسە ئەم وشترە خوا پێی داویـت، شـکاتت لێدەکات و ئـەڵێت تـۆ زۆر برسـی و ماندووی دەکەیت.

خـاتو عائیشـەی دایکـی بـاوەڕداران (خـوا لێـی ڕازی بێـت) وشـترێکی هـەبوو هاتووچـۆی پێـدەکرد، پێغەمبـەر(ﷺ)پێـی فـەرمووی: بەسـۆزو میهرەبان بە لەگەڵی ئەی عائیشە.

چەندین نمونەی تر هەیە کە دەتوانی بۆی باس بکەیت.

ئەگەر بتوانی منداڵەکان ببەیت بـۆ سـەردانی گـۆڕی پێغەمبـەر(ﷺ) و فێری ئادابی مزگەوتی بکەی – بەتایبـەت مزگـەوتی پێغەمبـەر و مەککـەی پـیرۆز، بـۆی بـاس بکـە کـە هـەرکات سـەلاوات بـدەی لەدیـداری پێغەمبەر(ﷺ)، خوای گەورە ڕۆحی دەگێڕێتەوە لاشەی خـۆی وەلامـمان ئەداتەوە، فێـری بکـە کـە لـەنزیك گـۆڕی پێغەمبـەر(ﷺ) دوعامـان کرد، دەبێت ڕووبکەینـە قیبلـە، موسـڵمان دەبێـت تـەنیا داوا لـەخوای گـەورە بکات.

باسی فەزڵ و گەورەیی ڕەوزەی پیرۆزی بۆ بکە، سووربوونی خۆتی بۆ نیشان بدە کە بچنە ئەو شوێنە پیرۆزە و تێدا بمێننەوە، ئێمە پارەیەکی زۆر خەرج دەکەین بۆ منداڵەکانمان بۆ خوێندن و جل و بەرگ و پۆشاك و خۆشی و سەیران و گەڕانیان تا پاشەڕۆژێکی دنیاییان بۆ دابین بکەین، سەردانی ئەو شوێنە پیرۆزەش هیچی کەمتر نییە لەو شتانەی کە لەسەرەوە ئاماژەمان بۆ کرد، چونکە بەم سەردانەی زیاتر لەخوای گەورە و پێغەمبەر(ﷺ) نزیك دەبێتەوە، بەمەش دوا ڕۆژی خۆی مسۆگەر دەکات إن شاء الله.

دەرکەوتووە سەردانیکردنی ئەو شوینە پیرۆزە گەر لەسەرەتای تەمەنی بێت، کاریگەری زۆرترە لەسەر دڵ و دەروونی و زیاتر دامەزراوتری دەکات، پارێزتر دەبێت لەشەیتان و زۆرتر پابەند دەبێت بە ئایینی ئیسلامەوە تا کۆتایی تەمەنی.

ئەگەر بە منداڵەکە بڵێت، ئەم گەشتەی عومرە دیاری دەرچوونت بووە، یاخود لەبەر جوانیی کردەوەکانتە، ئەمەش دەبێتە هاندانێکی زۆرباش بۆی.

زۆرجار دیاری و پاداشتی بدەرێ و پێی بڵێ: ئەمە دیاریی ئەو دە سەڵاواتەیە کە لەدیداری پێغەمبەر(ﷺ)داوتە لە کاتی بەر لە نوستنت یان دوای نوێژەکەت، یاخود کاتی دڵتەنگی و ناڕەحەتییەك، تاوەکو ڕادێت لەسەری.

باسی فەزڵ و گەورەیی ڕەوزەی پیرۆزی بۆ بکە، سووربوونی خۆتی بۆ نیشان بدە کە بچنە ئەو شوێنە پیرۆزە و تێدا بمیننەوە، ئێمە پارەیەکی زۆر خەرج دەکەین بۆ منداڵەکانمان بۆ خوێندن و جل و بەرگ و پۆشاك و خۆشی و سەیران و گەڕانیان تا پاشەڕۆژێکی دنیاییان بۆ دابین بکەین، سەردانی ئەو شوێنە پیرۆزەش هیچی کەمتر نییە لەو شتانەی کە لەسەرەوە ئاماژەمان بۆ کرد، چونکە بەم سەردانەی زیاتر لەخوای گەورە و پێغەمبەر(ﷺ) نزیك دەبێتەوە، بەمەش دوا ڕۆژی خۆی مسۆگەر دەکات إن شاء الله.

دەرکەوتووە سەردانیکردنی ئەو شوێنە پیرۆزە گەر لەسەرەتای تەمەنی بێت، کاریگەری زۆرترە لەسەر دڵ و دەروونی و زیاتر دامەزراوتری دەکات، پارێزتر دەبێت لەشەیتان و زۆرتر پابەند دەبێت بە ئاینی ئیسلامەوە تا کۆتایی تەمەنی.

ئەگەر بە منداڵەکە بڵێت، ئەم گەشتەی عومرە دیاری دەرچوونت بووە، یاخود لەبەر جوانیی کردەوەکانتە، ئەمەش دەبێتە هاندانێکی زۆرباش بۆی.

زۆرجار دیاری و پاداشتی بدەرێ و پێی بڵێ: ئەمە دیاریی ئەو دە سەلاواتەیە کە لەدیداری پێغەمبەر(ﷺ)داوتە لە کاتی بەر لە نوستنت یان دوای نوێژەکەت، یاخود کاتی دڵتەنگی و ناڕەحەتییەك، تاوەکو ڕابێت لەسەری.

## سێیەم: قۆناغی نێوان یانزە ساڵ تا سیانزە ساڵ

لەم قۆناغەدا واباشە ناڕاستەوخۆ باسی ئاکار و ڕەوشتی جوان و پەسەندی پێغەمبەر(ﷺ)ی بۆ بکەیت، لەکاتی کۆبوونەوەی خێزانیی بۆ نانخواردن، یاخود لەکاتی چوونە دەرەوەیەك لە پشووی کۆتایی هەفتەدا، یاخود لە چوون بۆ گەشتێك سیدییەك لە ڕێگای تەسجیلی سەیارەکەوە بخرێتە سەری کە باسی پێغەمبەر(ﷺ) بکات، یاخود کتێبێکی بەدیاری پێ بدە کە باس لە موعجیزات یان باسی ئاکار و ڕەوشتە بەرزەکانی بکات.

**لەم قۆناغەدا ئەتوانی ئەم باسانەی خوارەوەی بۆ بکەیت.**

**١- ئاکاری موحەمەدی**

پێغەمبەر(ﷺ) ڕەوشتێکی چاکی هاوەڵێتیکردن و ڕەفتارکردنی هەبوو، کە لەگەڵ هاوەڵەکانیدا بە ڕێگەدا بڕۆیشتبایە ئەوانی پێشدەخست و خۆی پێشیان نەدەکەوت، ئەم سڵاوی دەکرد، وتەکانی کورت و کەم و پڕ مانا بوو، نەخۆیی لە ئیشیان هەڵدەقورتاند و نە کەمتەرخەمیشیی بەرانبەریان دەکرد، دەیفەرموو: "لەجوانیی تۆی موسڵمان ئەوەیە، خۆت لە کارێك هەڵنەقورتێنی کە پەیوەندیی بە تۆوە نییە" یان دەیفەرموو: "ئەوەی بڕوای بە خوای گەورە و ڕۆژی دوایی هەیە، با قسەی چاك بکات یاخود بێدەنگ بێت".

زۆر بێدەنگ بوو، هەمیشە بیری دەکردەوە، ڕەوشت نەرم بوو، نە وشك و نە بەسووك زان، ناز و نیعمەتی بە گەورە ڕادەگرت گەر کەمیش

بووایە، هیچ شتێکی دنیا تووڕەی نەدەکرد، کە تووڕە بووایە پشتی هەڵدەکرد، کە دڵخۆشیش بووایە بەسادەیی دەنواند، پێکەنینی زەردەخەنە بوو، تێکەڵی قسە و باسی هاوەڵانی دەکرد گەر باسی دنیا بوایە یان خواردن و خواردنەوە بوایە، ڕەخنەی لەخواردن نەدەگرت؟ بەدڵی بوایە دەیخوارد، حەزی لێ نەبوایە وازی لێدەهێنا، دەیفەرموو:"ئیمانی باوەڕدار کامڵ و تەواوە گەر خاوەنی جوانترین ڕەوشت و ئاکار بێت". هەروەها دەیفەرموو:"خۆشەویسترین و نزیکترینتان لە منەوە لەئاخیرەتدا، کەسە بەڕەوشتەکانە"،پرسیاری لێکرا دەربارەی کاری باش، فەرمووی:"ڕەوشتی جوان"پرسیاری لیکراوە کام کار و کردەوە زۆر گەورەیە؟ فەرمووی:"ڕەوشتی جوان".

پێغەمبەر(ﷺ) زۆر بەتەنگ دروست کردنی خۆشەویستی و لێبوردەیی بوو، بۆیە هەمیشە ئامۆژگاریی هاوەڵانی دەکرد و دەیفەرموو:"ئەگەر سێ کەس بوون، دووانتان چپە نەکەن و سێیەم پەراوێز بخەن، ئەو کارە کەسی سێیەم خەمبار دەکات".

یان دەیفەرموو:"هیچ کەس لە ئێوە کە هاتە نێو مەجلیسێکەوە، باکەس هەڵنەسێنی تا جێگەی خۆی بکاتەوە، بەڵکو بازنەی مەجلیسەکە فراوان بکەن خوای گەورە بۆتان فراوان دەکات".

لە فەرمودەیەکی تردا هاتووە دەفەرموێت:"بۆ هیچ کەس ڕێگە پێدراو نییە بچێتە نێوان کەس دابنیشێ مەگەر خۆیان مۆڵەتی بدەن".

له بارەی سەلام کردنەوە فەرمویەتی:"ئەو کەسەی سوارە با سەلام بکات لەو کەسەی پیادەیە، ئەو کەسەی دەڕوات سەلام بکات لەوەی دانیشتووە، ئەو کۆمەڵەی کەمن سەلام بکەن لەو کۆمەڵەی کە زۆرن، بچووك سەلام لە گەورە بکات".

کلوەی کوڕی حەنبەل بۆمان دەگێڕێتەوە:کە صەفوانی کوڕی ئوممەیە دیارییەکی پێدام بیدەمە پێغەمبەر(ﷺ)،چوومە خزمەتی نە ڕووخسەتی چوونە ژوورەوەم خواست و نە سەلامم کرد، پێغەمبەر فەرمووی:"بگەڕێوەو بڵێ: السلام علیکم".

پێغەمبەر(ﷺ)زۆر بەتەنگ ڕێزگرتن و پاراستنی کەرامەتی مرۆڤەوە بوو، چونکە خوای پەروەردگار مرۆڤی بەڕێزو شکۆوە دروست کردووەو ڕێزی لێناوە.

ڕاستەوخۆ هەڵەی بۆ کەس ڕاست نەدەکردەوە، بەڵکو دەیفەرموو:"ئەوە چۆنە کەسێ ئاواو ئاوا بکات"ئەو کەسەی هەڵەکەی کردبوو خۆی چاکدەکرد بێ ئەوەی بیشکێنێ و هەست و سۆز و کەرامەتی بریندار بکات لەناو خەڵکییدا.

موعاویەی کوڕی حەکەم دەڵێت: لەپشتی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) نوێژم دەکرد، کەسێك پژمی، منیش وتم (یرحمك الله) هەمووان چاویان تێ بڕێم.

منیش وتم بۆ واسەیرم دەکەن؟ ئەوانیش بەلەپی دەستیان لەدەستەکەی تریان ئەدا، زانیم بۆ ئەوە وادەکەن کە بێدەنگ بم، منیش

بێدەنگ بووم، دوای تەواو بوونی نوێژەکە پێغەمبەر(ﷺ) بەفیدای بم وەك باشترین و مامۆستا و ڕێنیشاندەر، نە تووڕەبوو لێم نە قسەی ناخۆشیی کرد بەرامبەرم، نە لێمی دا، تەنیا فەرمووی:" ئەمە نوێژە نابێت قسەی تێدا بکرێت ،بەڵکو تەنیا تەسبیح و تەکبیر و قورئانی تێدا دەخوێنرێت".

لەگەڵ ئەم هەموو کردەوە چاکانەی کە هەیبوو دەیفەرمو:"اللهم كما حسنت خَلْقِي فحُسِّنْ خُلُقِي".

واتا:خوای پەروەردگار چۆن شێوە و ڕوخسارمت جوان کردووە، ڕەوشتیشم جوان بکە.

ب- بەخشندەیی موحەممەدیی

بەخشندەیی پێغەمبەری خوا(ﷺ)کەم وێنەبووە، هیچ کاتێك دەستی نەناوە بەڕووی کەسەوە کە داوای کردبێت، جارێك پیاوێك داوای جل و بەرگی بەری دەکات، یەکسەر ئەچێتە ماڵەوە خۆی ئەگۆڕێت و جل و بەرگەکەی ئەدات بەو پیاوەی داوای کردبوو، پیاوێك داوای ڕانە مەڕێکی لێکرد، ئەویش پێی بەخشی، پیاوەکە باوەڕی نەکرد ڕایکرد بۆلای کەس و کاری وتی: ئەی کەس و کارم باوەڕ بێنن بە موحەمەد، چونکە ئەو بەخشندەیە بەجۆرێك دەبەخشێت کە لە هەژاریی ناترسێت.

لەفەرمودەیەکدا کە لەبوخارییدا هاتووە، کە عبداللەی کوڕی عەباس دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا بەخشندەو سەخییترین خەڵکیی بوو، بەزۆریی لە مانگی ڕەمەزاندا بەخشینی زیاتربوو.

## هەندێك نمونە لەبەخشندەیی پێغەمبەری خوا(ﷺ)

پێغەمبەر(ﷺ) هێندە ئاڵتوونی بەخشی بە عەباس كە لەتوانایدا نەبوو هەڵیبگرێت.

مەعوزی كوڕی عفرا هەندێك ترۆزیی و خورمای بۆ پێغەمبەر هێنا، ئەویش پڕبەدەستی خشڵ و ئاڵتونی بەدیاری پێدا.

پیاوێك هاتە خزمەتی و داوای هەندێك پێویستیی لێكرد، پێغەمبەر(ﷺ) بەكابرای فەرموو: "ئێستا هیچمان نییە، بڕۆ لەبازاڕ چی پێویستییت هەیە بیبە من پارەكەی ئەدەم".

ج- نەرمونیانیی موحەمەدیی

نەرمونیانی ئەوەیە لە كاتی توڕەبووندا دان بەخۆتدا بگری، لەم ڕووەوە پێغەمبەر(ﷺ) پێشەنگ بووە، ژیانی پڕە لە نمونەی زۆر جوان.

لە جەنگی ئوحوددا كە بێباوەڕان دانی پیرۆزی پێغەمبەریان شكاند، لەوكاتەدا دەستی بۆ ئاسمان بەرزكردەوە و دوعای كرد و فەرمووی: "خوایە لە قەومەكەم خۆشە بەڕاستی ئەوان نەزانن."

كاتێك كابرایەكی دەشتەكیی هاتوو یەخەی توند گرت، بەجۆرێك ئازاری ملی پێغەمبەری دا كە ملی پیرۆزی خەتێكی سووری تێدا دروست بوو، هاواری كردو وتی لەو ماڵەی خوا پێتی داوە باری ئەو دوو وشترەم بدەرێ، خۆ لەماڵی خۆت و باوكت پێمی نادەی، پەیامبەری خوا(ﷺ) نەرموونیانیی بەرانبەر نواند و فەرمووی: "ماڵەكە ماڵی خوایەو منیش بەندەی خوام، ئەی ئەعرابی تۆڵەی ئەو قسەیەت لێ دەكەمەوە، وتی: نە.

فەرمووی: بۆچی؟ وتی: تۆ بەخراپە وەڵامی خراپە نادەیتەوە، پەیامبەر پێکەنی، پاشان فەرمانی کرد کە باری وشترێك جۆو باری وشترەکەی تری خورمای بدەنێ.

پێغەمبەر(ﷺ) لە ژیانیدا لە خزمەتکار و ئافرەتی نەداوە، ئەم پرسیارە لەخاتوو عائیشەی دایکی ئیمانداران کرا (خوا لێی ڕازی بێت)،ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: ئەگەر شتێکی حەرامکرا و نەبوایە، ئەوە مافی بۆ کەسەکە وەردەگرتەوە و پێی دەدایەوە، لێدانی هیچ شتێکی نەکردووە و بە دەستی لەکەسی نەداوە، تەنیا لە جیهاد لە پێناوی خوای گەورەدا نەبێ، هەرگیز لەخزمەتکار و ئافرەتی نەداوە.

ج- لێبوردەیی موحەمەدیی

لێبوردەیی چییە؟وازهێنانی تۆڵەکردنەوەیە لەو کەسەی خراپەی کردووە بەرامبەرت لەکاتێکدا توانات هەبێت: لە ڕەوشتی پێغەمبەر(ﷺ) بووە، خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردووە، لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە دەفەرموێت:

﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ١٩٩ ﴾ (الأعراف).

واتا: دەست بگرە بە لێبوردەیی یەوە(چاوو پۆشی بکە) فەرمانیش بدە بە چاکە و چاکە کردن و ڕوو وەرگێڕە لە نەفامان و نەزانان واتە وازیان لێ بێنە.

پرسیار لە پێغەمبەر(ﷺ)کرا دەربارەی مانای ئەم ئایەتە، ئەویش فەرمووی:" لەخوای گەورە دەپرسم"،خوای پەروەردگاریش پێی فەرموو:

ئەی موحەمەد خوای گەورە فەرمانت پێدەکات، هاتووچۆی ئەوانە بکەی که تەرکی هاتوچۆیان کردوویت، ببەخشی بەوانەی کە پێت نابەخشن. لەوانە ببوریت کە ستەمت لێدەکەن.

پێغەمبەر(ﷺ) پەیڕەوی لە فەرمانی پەروەردگار کرد و دەبینن.

ئەگەر لە نێوان دوو کاردا بوایە، ئەوا کارە ئاسانەکەی هەڵدەبژارد، بەمەرجێك کارەکەی تر تاوان نەبوایە، ئەگەر تاوان و سەرپێچیی بوایە، ئەوا دوورترین کەس بوو لێیەوە.

لێبوردەیی ئەو لەوەدا دەبینین کاتێك "غورسی کوری حارث" ویستی پێغەمبەر(ﷺ)بکوژێت کاتێك لە بن دارێك خەوت بوو، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بە خەبەر هاتەوە دەبینێ"غورسی کوری حارث "بەشمشێرێکەوە وەستاوە وتی: کێ تۆ ئەپارێزێت؟، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:"خوای گەورە،"غورس کوری حارث "شمشێرەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە، پێغەمبەر(ﷺ)شمشێرەکەی هەڵگرتەوە و فەرمووی:"کێ تۆ ئەتپارێزێ لە من؟" غورس ئەڵێت: تۆ بە لێبوردنت تۆڵەم لێ بکەرەوە، ئەویش وازی لێ لێهێنا و گەڕایەوە نێو قەومەکەی و وتی لای باشترینی خەڵکییە و هاتوومەتە لاتان.

لە کاتی فەتحی مەککە، کاتێك بەو هێز و دەسەڵاتەوە گەڕایەوە بۆ ئەو خاکەی کە لێوەی دەرکرابوو، ئەشکەنجە درابوو، بەدرۆزن و جادووگەر تۆمەتبارکرابوو، ئەو پیاوانە بە زەلیلیی لە بەردەمی وەستان و چاوەڕێی

تۆڵەکردنەوە بوون، بەڵام پێشەوای مرۆڤایەتیی کە بەڕەحمەت بۆ جیهان نێردراوە فەرمووی:"

ئەی قورەیش چاوەڕێی چی دەکەن لەمن؟"هەموویان وتویان: برایەکی بەخشندەو برازایەکی بەخشندەی، ئەویش فەرمووی:"بڕۆن هەمووتان ئازادن". لە هەموو ئەو تاوانانە خۆش بوو کە دەرهەق بەخۆی و هاوەڵانی کرابوو.

لە کاتی گەڕانەوەی لە شەڕی تەبوك دووڕووەکان پلانی کوشتنیان دانا، کاتێك پلانەکەیان ئاشکرا بوو، پێغەمبەر (ﷺ)لێیان خۆش بوو. کاتێك هاوەڵانی پێیان وت: بۆ لێیان خۆش دەبیت؟ فەرمووی:" ئەترسم خەڵکیی بڵێن موحەمەد هاوەڵانی دەکوژێت.

بێباوەڕان پێیان دەوت "مذمم"واتە زەمکراو، چونکە موحەممەد بەواتای سوپاس کراوە، هاوەڵان زۆر ناڕەحەت بوون بەم بێ ئەدەبییەی بێباوەڕان،ئەویش دەیفەرموو:" وازییان لێ بێنن ئەوان قسە بە زەمکراو دەڵێن من ناوم سوپاسکراوە".

د- ئازایەتیی موحەممەد

پێغەمبەر(ﷺ) نمونە بووە لە ئازایەتییدا، بەجۆرێك لە هیچ کار و ئەنگاوێك کە ناوێتی نەترساوە، خوای پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا ئەرمانی پێکردووە کە بەتەنیا خۆی بجەنگێ:

﴿ فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَۚ وَحَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ ﴾ (النساء).

واتا:ئەی موحەممەد(ﷺ) لەپێناوی خوادا بجەنگێ تۆ تەنیا ئەرکی خۆت لێ داواکراوە(یا تۆ تەنیا ئەرکی خۆتت لەسەرە) هانی بڕوادارنیش بدە(بۆ جیهاد).

## هەندێك لە وێنەی ئازایەتی و چاونەترسیی لە ژیانی پێغەمبەر(ﷺ)

ئیمامی عەلیی کوڕی ئەبی تالیب کە پاڵەوانی ئیسلامە، ئاوا وەسفی پێغەمبەری خوادەکات:

کاتێك لە شەڕی ئوحود موسڵمانان تووشی ئەو شکستە بوون، بەهۆی ئەوەی فەرمانی ئەویان شکاند، پێغەمبەر(ﷺ)وەکو شاخێك لە ورە و غیرەت راوەستا شەڕی کرد تا موسڵمانان لە دەوری کۆبوونەوە. بێباوەڕان نەیان توانی لەوە زیاتر بچنە پێشەوە و هێرشەکەیان ڕاگرت.

لە ڕۆژی حونەین کاتێك موسڵمان شکان و هەڵهاتن، پێغەمبەر(ﷺ) تەنیا پشتی هەڵنەکرد، بەڵکو بە دەنگی بەرز هاواری دەکردو دەیفەرموو:"من پێغەمبەرم و درۆناکەم...من کوڕی ئەوەی عەبدولموتەلیبم". لەناو مەیدانی جەنگەوە دەیفەرموو:"بۆ بەندەکانی خوا، بۆ بەندەکانی خودا"، کاتێك موسڵمان گوێیان لە دەنگی پێغەمبەر بوو گەڕانەوە و شەڕیان کرد و سەرکەوتووبوون.

هـ- ئارامگریی موحەممەدیی

ئارامگری، ڕاهێنانی دەروونە لەسەر گوێڕایەڵیی پەروەردگار کە لێی دوور نەکەوێتەوە، خۆی بەدوور بگرێت لەسەرپێچیی پەروەردگار،

پێغەمبەر(ﷺ) بەدرێژایی کاروانی بانگەوازی ئەو بیست و سێ ساڵە، نموونەیەکی پڕاوپڕبووە لە ئارامگری.

## چەند نموونەیەك لەژیانی پێشەوای مرۆڤایەتیی

ئارامگریی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ئازار و ئەشکەنجەی قورەیش لە پێش کۆچکردنی بۆ مەدینە، ئارامگربوو بەرامبەر بوختان و جنێو و سوکایەتی پێکردنی، جارێك کە پیسایی وشتریان کرد بەسەریدا کاتێك ئەو نوێژی ئەکرد لە حەرەمی مەککەی پیرۆزدا، ئارامگربوو بەرامبەر بەو بوهتانەی جارێك ئەیانوت شێتە، جارێك ئەیانوت شاعیرە، کاهینە، یاخود ئەشکەنجەی هاوەڵانیان ئەدا یان دووریان خستنەوە بۆ شیووی ئەبی تالیب و گەمارۆیان خستەسەریان، یان هەوڵی تیرۆرکردنیان دا و چەند کەسێکیان بۆ نارد شەهیدی بکەن، بەڵام خوای گەورە پاراستی و سەلامەت بوو.

ئارامگربوو کاتێك خاتوو خەدیجەی هاوسەری کۆچی دوایی کرد، ئەو هاوسەرەی کە بەسۆز بوو بەرامبەری کاتێك هەموو دونیا بێباوەڕ بوو ئەو باوەڕی پێیکرد، کاتێك خەڵکیی دەریانکرد ئەو گرتیە خۆی، کاتێك خەڵکیی لێیان گرتەوە ئەو پێی دەبەخشی، کاتێك خەڵکیی تۆمەتی بۆ دروست دەکرد، ئەو پشتی دەگرت, کاتێك لە سەختترین کاتدا خاتوو خەدیجە کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەر(ﷺ) ئارامی گرت و بە لەدەستدانی

ورەی نەڕووخا و هیچ کاری نەکردە سەر تواناکانی، بەڵکو تەنیا ئارمگر بوو بە لەدەستدانی.

ئارامگربوو لە هەموو شەڕەکانی بەدر و ئوحود و خەندەق و فەتحی مەککە و حونەین و تائیف، کاتێك ڕووبەڕووی شەڕێك بوویەوە، لە تەبوك نەترسا نەشکستی هێنا و نەشکا، جگە لە سەپەرشتی کردنی چەندین سریە و بۆ ماوەی دە ساڵ لەم شەڕ بۆ ئەو شەڕی تر، ئەی ئەوە ئارامگرییەکە، مەگەر ئەمە گەورەترین ئارامگرییەك نییە؟

ئارامگریی لەسەر برسێتی، پێغەمبەر(ﷺ)هەتا لەدنیاش دەرچوو رۆژێك نەبووە دوو ژەم کولێرەی جۆی خواردبێت، ئەیتوانی داوا لەخوای پەروەردگار بکات هەموو ناز و نیعمەتی دنیا بخاتە بەردەستی، بەڵام خۆشییەکانی بەهەشتی هەڵبژارد.

### سۆزی موحەمەدیی

پێغەمبەر(ﷺ) سۆزی خەڵکانی بەهێز و بەتوانای هەبوو نەك سۆزی خەڵکانی لاواز و بێ دەسەلات، بە باوەڕ بە پاداشتی خوایی مومارەسەی دەکرد و بەشێك بوو لەسروشتی.

پەروەردگار لەبارەی ڕەحم و سۆزیەوە بەرامبەر هەموو خەڵکیی ئەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ۝١٠٧ ﴾ (الأنبياء).

واتا: بەراستی تۆمان ناردووە بە ڕەحمەت بۆ هەموو خەڵکی.

لە بارەی ڕەحمەتی تایبەت بەرامبەر باوەڕداران، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴿٤٣﴾ ﴾ (الأحزاب).

واتا:بە بەزەیی یە بەئیمانداران.

لە دوای ئەوەی لەمەککە ئازاری زۆر درا، ڕۆیشت بۆ تائیف، لەوێیش بەناشیرینترین شێوە کەوتنە بەردە باران کردنی هەتا خوێن بەقاچی پیرۆزیدا هاتە خوارەوە، پێغەمبەر(ﷺ)شەکوای حاڵی خۆی کرد بۆ پەروەردگار و فەرمووی:"خوایە لاوازی و بێ چارەیی و بێ توانایی بەرامبەر خەڵك دەهێنمە لای تۆ، جوبرئیل (علیە السلام) دابەزی و فەرمووی:(ئەی موحەمەد، ئەگەر بتەوێ ئەو دوو شاخە دێنمەوە یەك و لاناویان دەبەم. پێغەمبەری ڕەحمەت و بەسۆز فەرمووی:"نەخێر، بەڵکو لە نەوەی ئەمان کەسانێك بێنە دنیاوە خوا پەرست و یەکتا پەرست بن".

پێشبینییەکەی ڕاست دەرچوو، لە نەوەی ئەمان کەسانی خواپەرست و یەکتاپەرست هاتنە ناو ئایینی ئیسلامەوە.

پێغەمبەر(ﷺ) تەنانەت بەرامبەر بەوانەشی کە شەڕی لەگەڵ دەکردن بەڕەحم و میهرەبان بوو، بۆیە هەموو جارێك ئامۆژگاریی سوپاکەی دەکردو دەیفەرموو:"شەڕ لەگەڵ کەسێك مەکەن کە شەڕی نەکردووە لەگەڵتان، ژن مەکوژن، منداڵ و پیاوی بەتەمەن مەکوژن، داری خورما و کشتوکاڵ مەسوتێنن، ئیهانە بەلاشەی کوژراوەکان مەکەن".

لە فەرمودەیەکدا کە ئیمامی بوخاریی لە ئەنەسەوە دەگێڕێتەوە، کە لاوێکی جولەکە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)ئەکرد، ئەم لاوە نەخۆش کەوت،

پەیامبەر چوو بۆ سەردانی و پێی فەرموو: "موسڵمان ببە"، لاوەکە سەیری باوکی کرد، ئەویش وتی بەقسەی ئەبا قاسم بکە، لاوەکە موسڵمان بوو، پێغەمبەر(ﷺ) چووە دەرەوە و فەرمووی: "سوپاس بۆ ئەو خودایەی ڕزگاری کرد لەئاگر".

پێغەمبەر(ﷺ) ئامۆژگاریی کردووین بەرامبەر کەسانی کەمدەست و بێدەراتان باش بین، لە بارەی ئەو کەسانەی دایك یان باوکیان ئەمرێت فەرمویەتی: "باشترین ماڵێك، ئەوەیە کە هەتیوێکی ڕێزگیراوی تێدا هەبێ".

لە بارەی ئافرەتانەوە فەرمویەتی: "لەگەڵ ئافرەتاندا باش مامەڵە بکەن"،تەنانەت لە کۆتا وتاری ماڵئاواییدا فەرمووی: "لەگەڵ ئافرەتاندا باش بن".

پێغەمبەر(ﷺ) لە سۆز و ڕەحمەتی دەربارەی ئوممەتەکەی ئەم ئایەتەی دووبارە دەکردەوە کە خوای پەروەردگار دەربارەی ئیبراهیمی پەیامبەر(علیه السلام) فەرمویەتی:

﴿ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ فَمَن تَبِعَنِى فَإِنَّهُۥ مِنِّى ۖ وَمَنْ عَصَانِى فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٦﴾ ﴾ (إبراهيم).

واتا: ئەی پەروەردگارم بێگومان ئەو بتانە زۆر لە خەڵکیان گومڕا کردووە(و لایان دان لەڕێگەی ڕاست) جا هەر کەسێ (لەڕۆڵەکانم) شوێنی من کەوت ئەوە بێگومان لە منە هەرکەسیش سەرپێچی کردم ئەوە بێگومان تۆ لێبوردەی میهرەبانی.

یـان ئـەو ئایەتـەی دەربـارەی عیسـا (علیـه السـلام) و قەومەکـەی دەوتەوە:﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ ۖ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١١٨﴾ ﴾ (المائدة).

واتا: ئەگەر سزایان بدەیت، ئـەوە بێگومـان بەنـدەی خـۆتن وە ئەگـەر لێشیان خۆش ببی ئەوە بێگومان تەنیا خۆتی بەدەستەڵاتی کاردروست.

پاشـان دەسـتی بـەرزکردەوە فـەرمووی :"اللـهم أمـتي أمـتي"، واتـا: دەستی کردە گریان و فەرمووی: خوایە گیـان ئوممەتەکـەم ئوممەتەکـەم. خوای پەروەردگار زانایە بەهـەموو کاریـك، فـەرمانی بـە جوبرەئیـل دا کـە پرسـیاری لێبکـات دەربـارەی گریانەکـەی ،جوبرەئیـل هاتـە خزمـەتی و فـەرمووی: بۆچـی دەگریـت؟ پێغەمبـەر(ﷺ) هۆکـاری گریانەکـەی پـێ فەرموو.

پەروەردگار جوبرەئیلی ناردەوەو فەرمووی بە موحەمەد ڕابگەێنە، کە ئێمە لە بارەی ئوممەتەکەیەوە بەدڵی ئەو دەکەین.

### ئەمەکداریی موحەمەدیی

پێغەمبـەر(ﷺ) زۆر بـەوەفابوو، بـەوەفابوو بەرامبـەر بەپـەروەردگار، بـەوەفابوو بەرامبـەر بـەو کەسـەی بـەخێوی کـرد، بـەوەفا بـوو بەرامبـەر بەهاوسەرەکانی، بەوەفابوو بەرامبەر بەهاوەڵەکانی، بەوەفا بوو بەرامبـەر هەموو دروستکراوەکان.

خاتوو عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت)ئەڵێ: شەوان ئەوەندە شەو نوێـژی ئەکرد هەتا پێکانی ئاوسان، منیش پـێم وت بـۆ بـەو جـۆرە خـۆت مانـدوو

دەکەی، مەگەر پەروەردگار لە تاوانی پاش و پێشت خۆش نەبووە؟
پێغەمبەر(ﷺ) پێمی فەرموو: ئەی نابێت بەندەیەکی سوپاس گوزاربم.

رۆژێك لە مەدینەدا پیرەژنێك هاتە خزمەتی، پێغەمبەر(ﷺ) لەبەر پێی هەڵسا و پێشوازییەکی زۆر گەرم و گوڕی لێکرد، عەباکەی خۆی بۆ ڕاخست، کە ڕۆیشت خاتوو عائیشە ئەفەرموێت لێم پرسی هۆکاری ئەو هەموو ڕێز و گەرم و گوڕییەت چی بوو لەو پیرەژنە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:" ئەو کاتەی خەدیجە مابوو سەردانی دەکردین".

لە نێوان ژوورەکەی و مینبەرەکەیدا چەند مەترێك بوو، کە ڕۆژانە هەنگاوی لەسەر دەنا و نوێژی لەسەر دەکرد، ئەو چەند مەترەی زۆر خۆش دەویست، چونکە هەنگاوی دەنا بۆ نوێژ، خۆی دەیفەرموو نوێژ نوری چاوەکانمە، ئەو چەند مەترەی نێوان ژوورەکەی و مینبەرەکەی زۆر خۆش دەویست و ڕێزی لێناو دەربارەی فەرمووی:" ما بين منبري و بيتي روضة من رياض الجنة "

واتا: لەنێوان مینبەرو ماڵەکەمدا باخچەیەکە لە باخچەکانی بەهەشت.

ئەم چیرۆك و بەسەرهاتانە لە باشترین کات بۆ منداڵەکەت بگێڕەوە، بۆ نموونە بەر لە خەوتنی کاتێك گڵۆپەکانت کوژاندۆتەوە، یاخود کاتێك کە ئەو حەز بە گوێگرتن بکات.

ئەگەر دایك و باوك خۆیان توانای ئەم باسانەیان نەبوو، واباشە کاتێك چوون بۆ گەشتێك بەشریت لەناو سەیارەکە لێی بدەن، لەسەر پەروەردەکردنی منداڵەکانمان بەئاکار و ڕەوشتی پێغەمبەر(ﷺ) تووشی

گرفتێك دەبین، ئەویش ئەوەیە منداڵەکەت لە ناو کۆمەڵگە پێچەوانەی ئەم ڕەوشتانە دەبینێ، سەیر دەکات خزمەکانی درۆ ئەکەن، فێڵ ئەکەن، خۆیان بە گەورە دەزانن، ناو و ناتۆرە بەیەك ئەڵێن، لە هەمووشی خراپتر، ئەوەیە خزم و کەس و کار تۆ بەلاواز و گێل دەزانن کە پابەندی بەو ئاکار و ڕەوشتە جوانانەوە، ئەمەش ئەبێتە هۆی ئەوەی کە منداڵەکان تووشی تێکشان بن و گلەیی لە باوانیان بکەن لەسەر پەروەردەکردنیان لەسەرئەم ئاکار و ڕەوشتانە کە ئەمان لە زەمەنێکدا ئەژین ڕەوشت بەهای نییە، نووسەری ئەم نامیلکەیە ئاگادارت دەکاتەوە کە تووشی هەستی تێکشان نەبیت، چونکە ئەمە دەرگایەکە لە دەرگاکانی هاتنە ژوورەوەی شەیتان، ئەوەی منداڵەکان دەیکەن ئەو ڕاستە بە بەڵگەی ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:"نزیکترین کەستان لە قیامەتدا لە منەوە، خاوەن ئاکار و ڕەوشتە جوانەکانە، ئەگەر ئێمە لەبەر ڕەزامەندیی خوای گەورە فێری ڕەوشتی جوانیان بکەین، ئەوا پەروەردگار خۆی ڕێگایان نیشان ئەدات، لە کۆتاییشدا سەرکەوتن هەر بۆ ئەمانە ئەگەر لەم دنیاش نەبێت لە قیامەتدا سەرکەوتوو و سەرفراز دەبن.

منداڵ وا پەروەردە بکە کاتێك کاری هەڵە و چەوت و ناشیرینی بینیی بەخۆی بڵێ من لەسەر هەقم و ئەوان هەڵەن، لەسەرمە پابەندبم بەڕەوشتی جوانی خۆمەوە، ڕۆژێك ئەبێت ئەوان بێنە سەر ڕێگای من، هەروەك چۆن پێشەوای مرۆڤایەتیی بە تەنیا خۆی موسڵمان بوو لەسەر ئەم گۆی زەوییەدا، ئەگەر ئەوانیش نەهاتنە سەر ئەم ڕێگایە، ئەوا من إن شاء الله

ئەچمە بەهەشتەوە، وا باشترە کە من هاوکاریان بم بۆ دۆزینەوەی هـاوڕێی باشی وەك خۆیان، تاوەکو خۆیان بە نامۆ نەزانن.

هەمیشە دوعات لەبیر بێت بۆیان، بڵـێ: خوایـە هیدایـەتی منداڵـەکانم و منداڵی موسڵمانان بدە بۆ باشترین کار و کردەوەی چاك، جگە لە تۆ کەس نـاتوانێ هیدایـەتیان بـدات، خراپـەکانیان بسـڕەوە جگـە لـە خـۆت کـەس لەسەریان لانادات.

## قۆناغی نێوان چواردە ساڵ بۆ شانزە ساڵ

واباشە لـەم تەمەنـەدا دایـك و بـاوك لـە پشـووی هاوینـەدا بـۆ هانـدانی منداڵەکان پێشبڕکێ دروست بکەن لە نێوان منداڵەکان و خزمەکانیان، یان هاوسێ و هاوڕێکانی قوتابخانەی لەسەر ئەوەی کێ ئەتوانێ شتێکی کورت و پوخت لەسەر ژیانامەی پێغەمبەر(ﷺ)بنوسێ.

بۆ نمونە لەسەر ئەم بابەتانەی خوارەوە:

- ڕووداوەکانی پێش لەدایك بوونی پێغەمبەر(ﷺ).
- ڕووداوی فیل.
- عبداللەی باوکی، ئامینەی دایکی.
- منداڵیی و مێرد منداڵی.
- تەمـەنی گـەنجی و هاوسـەرگیریی لەگـەڵ خـاتوو خەدیجـە (ڕەزای خوای لەسەر بێت).
- پەیوەندیی لەگەڵ هاوسەرەکانی.

- پەیوەندیی لەگەڵ کچەکانی بەتایبەت فاتیمە.

- پەیوەندیی پێغەمبەر(ﷺ)بەهاوەڵانەوە و خۆشەویستیی ئەم بۆ هاوەڵان و خۆشەویستیی هاوەڵان بۆ ئەو.

- موعجیزەکان پێش و پاشی دابەزینی وەحی.

بەم هۆیەوە دەست دەکەن بەخوێندنەوە، بەمەش زۆرتر لەیادەورییاندا دەمێنێتەوە، چونکە ئەوان زۆر هەوڵ ئەدەن بۆ گەڕان بەدوای کۆکردنەوەی زانیارییدا، کۆی دەکەن و ڕێکی دەخەن و دەینووسنەوە و پاکنووسی دەکەن بەشێوەیەکی ڕێکو پێك.

وا باشە دیاری و پاداشت بدرێت بەباشترین کەسیان کە نووسینەکەی ئامادە کردووە، دیارییەکەش ئەو شتە بێت کە خۆی حەزی پێدەکات.



## چۆن خۆشەویستیی خۆمان بپێوین بەرامبەر بە پێغەمبەر(ﷺ)؟

پێویستە ڕۆڵەکانمان لەم قۆناغەدا فێربن خۆشەویستیی پێغەمبەر(ﷺ) پێویستیی بە بەڵگەیە، ئەوەندە بەس نییە بڵێین خۆشمان دەوێ ، بەڵکو پێویستە لە کردار و هەڵسوکەوتیاندا دەرکەوێ.

ئەمەش هەندێك پرسیارە کە یارمەتیت ئەدات بزانی تاچەندە پێغەمبەر(ﷺ)یان خوش دەوێت:

١- ئایە زۆر سەلاوات لە دیداری ئەدەین؟

ئەگەر کەسێکی خۆش بوێت، ئەوا لە بیری ناکات و هەمیشە لە یادی دەبێت و دوعای بۆ دەکات (ئیمامی ئیبن قەییم لەم بارەوە دەڵێت: بەندە هەرچەندە زۆر یادی خۆشەویست بکات و چاکەکانی لەدڵیدا ئامادەبی هەبێ، خۆشەویستی و تامەزرۆیی بۆی زیاتر ئەبێ ، بەلام گەر یاد و ئامادەیی لەدڵیدا نەبێ و چاکەکانی پێ نەزانێ، خۆشەویستیی لە دڵیدا کەم دەبێ.

٢- ژیاننامەکەیت خوێندۆتەوە ؟

کەسێکت خۆش بوێت، تامەزرۆی ئەبی بزانیت چۆن ژیاوە و چی کردووە ؟.

٣-ئایە پەیامەکەی شارەزایت؟

کەسێکت خۆش بوێت، دەبێت زۆر تامەزرۆ بی بزانیت وتە و بیر و بۆچوونەکانی چین؟.

٤- ئایە سوونەتەکانی جێبەجێ دەکەی؟

کەسێکت خۆش بوێت، دەبێت شوێن پێکانی هەڵبگریت.

٥-ئایە سەردانی مەدینەی پیرۆزت کردووە؟

کەسێکت خۆش بوێت تامەزرۆی بینینی ئەو شوێنەی کە تێدا ژیاوە و هەنگاو بنێی بەسەر شوێن پێکانیدا.

٦-ئایە ئال و بەیتی بەڕێزی و هاوەڵانی و شوێنکەوتووانیت خۆش دەوێت؟ چونکە کەسێکت خۆش بوێت ئەوانەشت خۆش دەوێت کە ئەویان خۆش دەوێت.

٧-ئایە قسەت بۆ ئەوانە کردووە کە هیچ لەبارەیەوە نازانن؟

گەر کەسێکت خۆش بوێت، حەز دەکەیت بۆ کەسانی تری باس بکەیت.

٨-گەر کێشەیەکت هەبوو ڕازییت بەفەرمانەکانی ئەو کێشەکەت چارەسەر بکرێت؟

گەر کەسێکت خۆش بوێت، ڕازیی دەبیت بەفەرمانەکانی هەرچی بێت، بیهێنە بەرچاوت گەر ئەو خۆشەویستە پێغەمبەر(ﷺ) بێت کە هیچی نەفەرمووە مەگەر بەنیگای پەروەردگاری نەبێت.

گەر وەڵامی ئەم پرسیارانەی بە "بەڵێ"دایەوە، ئەوە بزانە کە خۆشیان دەوێت، بەڵام هەندێك وەڵامیان بە "نەخێر"بوو،ئەوە پێویستە بەخویاندا بچنەوە.

گەر هەموو وەڵامەکانیان "بەڵێ"بوو تامەزرۆی دیداری پێغەمبەر(ﷺ) بوون، لە دنیادا ببینن، ئەوا ئەم چیرۆکەیان بۆ بگێڕەوە:

جارێك قوتابییەك دێتە لای مامۆستاكەی، پێی ئەڵێت مامۆستا ئەزانم تۆ لەخەوندا بە دیداری پێغەمبەر(ﷺ) شاد دەبیت، مامۆستاكەش وتی بەڵێ ڕاستە، قوتابییەكە بە مامۆستاكەی وت فێرم بكە چۆن بەدیداری شادبم، من زۆر تامەزرۆم ببیینم، مامۆستاكە پێی وت: بۆ نانی ئێوارە میوانی من بە، تا فێرت بكەم چۆن شاد بیت بەدیداری؟

قوتابییەكە بۆ نانی ئێوارە چووە خزمەت مامۆستاكەی و ئەویش خواردنێكی بۆ ئامادەكرد كە زۆر سوێربوو، نەیهێشت قوتابییەكە هیچ ئاوێك بخواتەوە ،مامۆستا سوور بوو لەسەر ئەوەی كە زۆر لەو خواردنە سوێرە بخوات، پاشان پێی وت بخەوە بەیانی پێت ئەڵێم چۆن خەو بە پێغەمبەر(ﷺ) دەبینی، بۆ بەیانیی مامۆستاكە بە قوتابیەكەی وت: ئێستا فێرت دەكەم كە چۆن خەوی پێوە دەبینی، بەس پێم بڵێ ئەم شەو خەوت بەهیچ شتێكەوە بینی؟ قوتابیەكە وتی بەڵێ، وتی بە چییەوە؟وتی بینیم باران دەبارێ، چەمەكان ئاویان پیدا دەڕۆشت، دەریاكان دەڕۆشتن، مامۆستاكە پێی وت: نیەتەكەت راست بوو بۆیە خەوت بەئاوەوە بینی، ئەگەر بەڕاستی پێغەمبەرت خۆش بوێت، ئەوا خەوی پێوە دەبینی.

یەكێك لەكارە زۆر گرنگەكان، ئەوەیە بۆیانی ڕوون بكەینەوە جیاوازیی بكەین لەنێوان خۆشەویستیی پێغەمبەر(ﷺ)و ئەوەی لەسنوری مرۆڤ دەری بكەین (مافی خوایەتیی پێ دان).

ئەوەی ئەیەوێت خوای پەروەردگار ڕازیی بکات بەخۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەوە دەبێت بەو شێوەیەی کە خوای گەورە و پێغەمبەر دەیەوێت نەك ئەوەی هەواو هەوەسی خۆمان حەزی پێدەکات.

لەو ڕوانگەوە خۆشمان بوێت کە خۆشەویستیی ئەو عیبادەتە، عیبادەتیش ئەبێت تەنیا لەبەر ڕەزامەندیی خوای گەورە بێت، لەسەر ڕێبازی خوای گەورە بێت، لەم دوو مەرجە دەرچوویت، ئەوا ئەبێتە ڕاهێنراو، ئەدرێتە بەنێوچاوی خاوەنەکەیدا، خوای پەروەردگاری ئاینی ئیسلامی تەواو کامڵ کردووە و دەفەرموێت:

﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ﴾ (المائدة).

واتا: ئەمڕۆ ئاینەکەتانم تەواو(کامل)کردوە بۆتان و چاکە و بەهرەی خۆم بەتەواوی ڕشتووە بەسەرتاندا و ڕازی بووم کە ئیسلام ئاینتان بێت.

ئاینی ئیسلام هیچ شتێکی بەجێ نەهێشتەوە، هەمووی باسکردووە، ئەگەر ڕەزامەندیی خوای گەورەمان مەبەستە نابێت هەر لە خۆمانەوە بیگۆڕین، هیچ کەسێك بەقەد هاوەڵان پێغەمبەری خوایان خۆش نەویستووە، بەڵام نەچوون کارێك بکەن سنور ببەزێنن، پێغەمبەر(ﷺ)خۆی فەرمویەتی: "وەکو شوێنکەوتووانی عیسای کوڕی مەریەم (علیە السلام) زیادەڕەویی مەکەن، من تەنیا بەندەی خواو پەیامبەری خوام".

جارێك پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) لە كاتی قسەكردندا وتی: ئەگەر خوا و تۆ ویستتان لەسەری بێت. پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو:"من دەكەیتە هاوشانی خوای گەورە، بەڵكو بڵێ: ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەربێت".

لە خۆشەویستیی پێغەمبەر(ﷺ) نابێت زۆر زیادەڕەویی بكەین و بیخەینەسەر و توانا و دەسەڵاتی پەروەردگار، پێویستە ئێمە مامناوەندبین، كە ئەوەش پەیڕەوی سووننەتە.

ئەبێت ئێمە منداڵەكانمان فێر بكەین كە نابێت هانا و هاوار بۆ پێغەمبەر(ﷺ)ببەین، دوای مردنیش نابێت داوا لەو بكەین، چونكە ئەو مردووە و هیچی بەدەست نییە، ناش بێت كە چووینە خزمەت گۆڕی پیرۆزی دەنگ بەرز بكەینەوە، خوای گەورە لەو بارەوە دەفەرموێت:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَـٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ﴾ (الحجرات).

واتا: ئەی ئەو كەسەی باوەڕتان هێناوە دەنگتان بەرز مەكەنەوە بەسەر دەنگی پێغەمبەردا(ﷺ) وە بە دەنگی بەرز قسەی لەگەڵ مەكەن وەك دەنگ بەرزكردنەوەتان لەگەڵ یەكتری ئەوەكو كردەوەكانتان بەتاڵ بێتەوە خۆشتان هەستی پێ نەكەن.

نابێت ڕووبكەینە گۆڕی پیرۆزی و دوعا بكەین، وادراستترە كە ڕووبكەینە قیبلە و ئینجا دوعا بكەین، هەرچی ڕێدراوە لە قسە و گوفتاردا،

ئەوە ئێمەش گۆڕەکەی دەبینین و سەلامی لێ دەکەین، سلاواتی زۆر ئەدەین لە دیداری.

ئاگاداری ئەم فەرمودە لاوازو هەڵبەستراوانەبن کە لەناو خەڵکیدا زۆر بلاوە،لەوانە:

(( من حج البيت ولم يزرني فقد جفاني ))

(( من زارني بعد موتي فكأنما زارني في حياتي ))

(( ليلة أسري بي رأيت على العرش مكتوبا : لا إله إلا الله محمد رسول الله )).

لە ئەزموونیی دایکانەوە:

ئافرەتێك ئەڵێت من باسی ژیاننامەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ منداڵەکەم دەکرد کە ئەو تەمەنی زۆر کەم بوو، کە تەمەنی بوو بە دە ساڵ خوای گەورە بۆی ڕەخساندین سەردانی گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ)مان کرد، کاتێك گەڕاینەوە منداڵەکەم پێی وتم من پێغەمبەری خوام زۆر خۆشدەوێت، ئاواتە خوازم لە بەهەشتدا بەدیداری شاد بم، بەس حەزناکەم ڕیشی هەبێت، حەز ئەکەم بێ ڕیش بیبینم، پێویست بوو دایکەکە جوان مامەڵە بکات و وتی کوڕی شیرینم من دڵنیام بیبینی زۆر خۆشتدەوێ ڕیشی هەبێ یان نە، منداڵەکە سوور بوو لەسەر قسەکەی دایکی، پێی وت: ئایا دەزانی بۆچی پەیامبەر خزمەتی ڕیشی دەکرد؟ وتی: نە. وتی: لەبەر ئەوەی جولەکە ڕیش ئەتاشن و سمێڵ ئەهێڵنەوە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ)پێچەوانەی ئەوانی کردووە، بۆیە کوڕی شیرینم تۆ ئەتەوێ

ماڵ بەحوڵەکە بچوینین؟! خێرا وتی نا، نا نا هاواری کرد و وتی هیچ کاتێك نامەوێ لەوان بچم، منداڵەکەم ئیتر ئەو بابەتەی دووبارە نەکردەوە.

دایکێکی تر ئەڵێت: گیرم خواردبوو بەدەست هاوڕێ و منداڵانی دراوسێکانمان، ئەوان باش پەروەردە نەکرابوون، نەیدەویست لە هاوڕێکانی دوور بخاتەوە، بۆیە دایکەکە بڕیاری دا لەپشووی هاویندا هاوەڵەکانی منداڵەکەی دەعوەت بکات بۆ ئەو یارییانەی کە هەیان بوو، کە تەواو بوون لەیاری کردن، هەندێك میوەو شەربەت و کێکی بۆ هێنان و دانیشت لەگەڵیان باسی چیرۆکی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ کردن و یەکێك لە ڕەوشتە جوانەکانی بۆ باس دەکردن و منداڵەکان زۆرجار قسەکەیان پێ دەبڕی، ئەویش گوێی لێدەگرتن و دواتر چیرۆکەکەی بۆ تەواو دەکردن، تاکۆتایی پشوی هاوین تەواو بوو چەند جارێك ئەوەی دووبارە کردەوە، سەیری کرد هەموویان ڕەوشت و هەڵسوکەوتیان گۆڕاوە بەهۆی بەسەرهاتەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ).

دایکێکی تر ئەڵێت: هەموو جارێك منداڵەکانم کۆدەکردەوە باسی ڕەوشتی پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد بۆیان کە ڕەوشتی چۆن بوو؟ چۆن بیری دەکردەوە؟ چۆن چارەسەری کێشەکانی دەکرد؟ بە شێواز و ڕێگای جۆراو جۆر هەتا دڵنیا بووم چاك تێگەشتوون، دوای ئەوە هەرکەسێکیان بکەوتایەتە کێشەیەکەوە کۆمدەکردنەوەو لێیم دەپرسین: پێغەمبەر(ﷺ) چۆن ئەم کێشەی چارەسەر دەکرد؟

دواتر پاداشتی ئەوەیانم دەکرد کە جوانترین پێشنیاری پێشکەش دەکرد، فێری دەکردن لە ژیاندا چۆن بە شێوازێکی کرداری و نوێ هیدایەتی پێغەمبەر(ﷺ)جێبەجێ بکەن هەتا ڕابێن کە گەورەش بوون هەر وابن و بتوانن لە چارەسەرکردنی کێشەکانیاندا هاوکاریی یەکتر بکەن.

**لەکۆتاییدا:**

ئەم چارەسەرەی کە خستوومەتەڕوو، ئومێدی ئەوەم هەیە خوای گەورە بیکاتە جێگای سوود، تەنیا خاڵێکی دەستپێکردنە و دایکان و باوکان و پەروەردەکاران لێیەوە دەست پێدەکەن تاوەکو منداڵەکانیان هان بدەن و پشتگیری بکەن بۆ خۆشویستنی پەیامبەر(ﷺ) ئەمە و دوای دڵنیا بوونەوە لە ڕاستیی ئەوەی ئەیڵێین هەروەك دەکرێت هەمان ڕێگە بگرێتەبەر بۆ چاندنی خۆشویستنی هاوەڵانی (ڕەزای خوایان لەسەربێت) لە دڵی منداڵەکانمان، سەرکەوتن بەخوای گەورەیە، سوپاس بۆ خوای پەروەردگار.



## سەرچاوەکان


١- فضيلة الشيخ محمد حسان. الشفاعة: خطبة مكتوبة، ومتاحة على موقع www.alminbar.com

٢- فضيلة الشيخ محمد صالح المنجد. لماذا نحب رسول الله صلى الله عليه وسلم؟ درس مسجل على موقع www.islamway.com

٣ – سعيد عبد العظيم.خير الكلام في الصلاة والسلام على رسول الله صلى الله عليه وسلم، الإسكندرية: دارالإيمان، ٢٠٠١.

٤–علاء داود. كيف نعلم أبناءنا حب الرسول؟ مقال في باب"حواء وآدم"،على موقع ص ١ www.islam-online.net

٥– تفسير الجلالين" وفضيلة الشيخ عبد الله النوري في كتابه " سألوني في التفسير"، منشورات ذات السلاسل، ص ١١٦ ،الكويت،١٩٨٦ .

٦ – خيرية صابر.الأم قدوة متحركة في أرجاء البيت،مقالة على الموقع: .article=١http://islamweb.net/pls/iweb/misc &thelan g=A١٢٦٩٥

٧ –الداعية الإسلامي الأستاذ عمرو خالد .محبة النبي، شريط من إنتاج شركة النور للإنتاج الإعلامي والتوزيع بالقاهرة.

٨– محمد سعيد مرسي– فن تربية الأولاد في الإسلام،القاهرة، دار التوزيع والنشر الإسلامية،١٩٩٨ .

٩- فضيلة الشيخ إبراهيم الدويش. توجيهات وأفكار في تربية الصغار: مقالة متاحة على الموقع.
www.islammemo.com/lessons

١٠- محبة الرسول (صلى الله عليه وسلم) مقالة متاحة على موقع:
www.islamweb.net .

١١ - أ. د. عبد الغني عبود.طفلك هبة الله لك.- القاهرة: سفير، ١٩٩٧ .

١٢- من شريط كاسيت أركان الإسلام إنتاج شركة "سفير"، والكلمات للشاعر صلاح عفيفي)

١٣- خالد محمد خالد . إنسانيات محمد، القاهرة، دار المعارف ١٩٩٨ .

١٤- أبو بكر جابر الجزائري.هذا الحبيب محمد رسول الله صلى الله عليه وسلم يا محب.المدينة المنورة: مكتبة العلوم والحكم، ٢٠٠٠ م.

١٥- مقالة منشورة في باب:" لطائف" " على موقع فور إسلام
www.forislam.com

١٦- أبو الحسن الندوي- سيرة خاتم النبيين للأطفال، القاهرة- دار الكلمة ١٩٩٨.

١٧- د. خالد أبو شادي. وا شوقاه رسول الله، القاهرة: دار الراية، ٢٠٠٢ م.

# ناومرۆك


| | |
|---|---|
| پێشەكی نووسەر | ٧ |
| چۆن منداڵەكانمان فێری خۆشەویستیی پێغەمبەر(ﷺ)بكەین؟ | ٢١ |
| یەكەم: پێشەنگی چاكەكار | ٢١ |
| دووەم: لەهەر تەمەنێكدا بەشێوازی گونجاو مامەڵەی لەگەڵدا بكە | ٢٣ |
| سێیەم: قۆناغی نێوان یانزە ساڵ تا سیانزە ساڵ | ٣٨ |
| هەندێك نمونە لەبەخشندەیی پێغەمبەری خوا(ﷺ) | ٤٢ |
| هەندێك لە وێنەی ئازایەتی و چاونەترسیی لە ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) | ٤٦ |
| چەند نموونەیەك لەژیانی پێشەوای مرۆڤایەتیی | ٤٧ |
| چۆن خۆشەویستیی خۆمان بپێوین بەرامبەر بە پێغەمبەر(ﷺ)؟ | ٥٦ |
| لەكۆتاییدا | ٦٣ |
| سەرچاوە | ٦٤ |
| ناومرۆك | ٦٦ |

